"تۆ نایابیت, چونکە ویســـتی دۆزینەوەی ماتەوزەکەی خۆت و دۆزینەوەی خودی خۆت و درکاندنی نهێنی بوون بەخۆت لەتۆدا هەیە, لەبەر ئەوەنا کە ئەم کتێبەت لە دەســـتە و لاپەڕی یەکەمی کتێبەکەت هەڵداوەتەوە!

لەبەر ئەوەی هەمیشـــە بەدوای برەودان بە تواناکانی خۆتی و ناترسی لەوەی ببیت بەخۆت."

## پێشەکی:-

کتێبێکی مرۆیی کۆمەڵایەتی و پەرە پێدەری خودییە نەك زانستی, ئامانج لە دارشتنی ئەم کتێبە خودناسییە لەپێناوی بەدەستهێنانی ژیانێکی سەربەرزانە و بونیادنانی تاکێك کە متمانەی بەخۆی هەبێت و ڕووبەڕووی هەر بەرزی و نزمییەك ببێتەوە کە دێتە ڕێگای خاوەنی ئامانج و بەرنامە و ستراتیژی تایبەت بەخۆی بێت بۆ ژیان, بەڵام پرسیارە سەرەکییەکە ئەوەیە ئایا چۆن ببین بەخۆمان و کێیە ئەو کەسەی کە خۆیەتی وە پێویستە چی بکەین لەو پێناوەدا؟

هەموو ئەوانە لەڕێگای حەفتاو حەوت خاڵی بەهێزەوە کە بە وردی دارێژراوە و کاریان لەسەر کراوە بەپێی ئەو تێڕامان و دیدگایەی کە هەمبووە لەسەر شێوازی بیرکردنەوە و قسە و کردارەکان دارشتنێکی پوخت بۆ بابەتەکان کراوە, بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە کەسایەتی خود چۆن کاریگەر دەبێت لەسەر مامە ڵە و پەرچەکرداری کەسانی تر بەرامبەر خۆت و هەروەها سە رکەوتنەکان و ڕێگا ڕاستەکان بناسین کە چین و چۆنن وە ناسینە وە بکەین و جیاکاری لەنێوان ئەو خەیاڵەی کە مێشکی داگیر کردوین و ئەو ژیانە ڕاستەقینەیەش بخەینەڕوو کە دەیگوزەرێنین چونکە پێوەری سەرکەوتن بریتییە لە لێکدانەوە بۆ ئەو ژیانکردنەی کە لە ئێستادا هەیە و دووربینیت بۆ چەند ساڵی داهاتوو وە لێکدانەوەی ئەو کردارانەی کە کردوومانە بە خوویەك و لەسەری دەڕۆین و هەڵبژاردنی ڕێچکەیەکی دروست, وە هاندانی خوودی بۆخۆمان ئەنجام بدەین لەپێناوی گەیشتن بە سە رکەوتن و سەربەرزی و ئارامی دەروون کە هەموو ئەوانە بە ئاسوودەیی ڕۆح دێنە کایەوە ئاسوودەیی ڕۆحیش لە ئەنجامی ئە وەوە دێتە کایەوە کە مرۆڤ هێندە شاد بێت بەوەی کە لە هەوڵە بێوچانەکانی بەردەوام بووە و بێ پسانەوە لە هیلاکی کاری کردووە و سوودی لەهەر هەلێك وەرگرتووە و هەڵەی کەسە

شـــكســتخواردووەكانی دووبارە نەكردۆتەوە و ڕێگا ڕاســتەكانی كەسانی سەركەوتووشی كردووە بە ئەزموونێك بۆ ژیانی خۆی و بەكاری هێناوە هەروەها بە ئامانجێكی دیاری كراوەوە ئاڕاســتەی ژیانی كەسی خۆی دیاری كردووە.
ببە بەخۆت كردنەوەی دەرچەیەكە بۆ خوێنەر كە تێیدا ڕۆچوونە نێو بابەتە جەدەل ئامێزەكانی پەیوەست بە بوون و هەست كردن و ڕازی بوون و شانازی بە بوون و پاشان بە كردەیی كردنی بابەتە كان بەو شـــێوەیەی كە خوێنەر دەیەوێت و دەیزانێت ئەوە لە ئامانجی" ببە بەخۆت"دایە, ســـەربەخۆیی هزری ســـەربەخۆیی بیركردنەوە و تێڕامانە جیاوازەكان و جیاوازی ڕاوبۆچوونەكان ژیان دەســـەلمێنن ئەگەر هەمووان وەك یەك بیریان بكردایەتەوە چەمكی (بوون وجود) دەكەوتە ژێر پرســـیارەوە, ببە بەخۆت بەڵێنی ســەركەوتنی هەمیشــەیی نییە بەڵكو دەنگێكی بەهێزە كە بە گوێتدا دەیچرپێنێ و پێت دەڵێت كۆڵ مەدە بەردەوامی پیشـــەی ئێمەیە و ڕووبەڕووی هەموو ســـەختییەك دەبینەوە لەپێناوی ئەنجامێكی باش چونكە بڕیار نییە هەموو ڕۆژەكانت وەك یەك بن و بڕیاریش نییە تاسەر لە سەختیدا بیت, تەنها ئەوە بزانە و بیری لێ بكەوە (كاركردنی ئەمڕۆت ژێرخانێكە بۆ دروســـتكردنی بەیانیت, ئەگەر ئەمڕۆ هەوڵ نەدەیت بەیانیت سەخت دەكەیت) كە واتە بەیانی چاوەڕێتە و بیكە بە ئەمڕۆیەكی پڕ چێژ بە شـــێوەیەك هەموو ئەمڕۆكانت لە ســـایەی دوێنێدا و هەموو بەیانییەكت لە ســـایەی ئەمڕۆدا پڕ چێژتر و خۆشـــتر بكە بەوەی دڵخۆشـــبیت و شانازی بە هەوڵەكانتەوە بكەیت و سڵیان لێ نەكەیتەوە.
ببە بەخۆت ئامانجی دەستپێشخەری و هەوڵدان و بەدواداچوونە نە وەك كورت كردنەوەی ژیان بەتەنها لە چەمكی (ســـەركەوتن) بە شـــێوەیەك ئەگەر ســـەركەوتوو نەبویت لە هەوڵەكانت ئەوا خۆت نیت, نا هەوڵی خۆت بدە و خودای گەورە خۆی باشترینی لەقەدەر نوســـیویت, ئەگەریش هەوڵت نەدا و بێهێزی خۆتت لە ئاســـتی تواناكانی خۆت و خســـتنەگەڕی ماتەوزەكەی خۆت نیشـــاندا ئە

وكات مافی ئەوەت نییە گلەیی لە ژیان و لەقەدەر بکەیت! لەبەر ئەوەی نەتتوانیوە ببیت بەخۆت.
بابەتەکان لە ڕێگای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسـلام ( محمد) ( ﷺ ) و وتە و پەند و ئامۆژگاری جۆراوجۆرەوە دەوڵەمەند کراون و خراونەتە بەردەستی خوێنەر لەپێناوی ئەوەی خزمەتێك بە مرۆڤایەتی بکەین و پارێزگاری لە بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتی بکەین و هێزی شـاراوەی هەر یەکێك لە خۆمان بدۆزینەوە و کاری لەسەر بکەین, بتوانین کەسایەتییەکی بەهێز بۆخۆمان بونیاد بنێین و بەهێزەوە لە ئاسـتی ئەو ئەرکە دابین کە لەسـەر شـانمانە و لەکۆتاییشـدا هیوادارم بتوانم کەلێنێکی بچوك لە کتێبخانەکانی کوردسـتان پڕبکەمەوە و مادەم تۆیش کەسـێکیت دەتەوێت ببیت بەخۆت لەگەڵمبە و وەرە بۆ ناوەڕۆکی کتێبەکە, بەڵام بەر لەوە ئەم دێڕەش بخوێنەوە" لەبەر ئەوە مەخوێنەوە کە بتەوێ تەواوی بیرۆکەی کتێبەکە لەسـەر خۆت جێبەجێ بکەیت, لەبەر ئەوە بخوێنەوە کە بیربکەیتەوە و سەرکردایەتییەکی دروستی خۆت بکەیت".

# مادام هەیت خۆتبە!

مەڕ ناو و ناوبانگێکی خراپی هەیە لەبەر ئەوەی ملکەچی هەر شتێکە کە پێی بوترێت تەنانەت بەبێ شوان و سەردارێك زۆرجار بەلارێدا دەڕوات, تۆ هەیت مادام دەبێت ببیت بەخۆت لەو کاتەی کە بوونت هەیە و خۆت نیت وەك ئەوە وایە( هەبیت و نەبیت ) باشـــە خۆت لەو کەین و بەینە ڕزگار بکە هەتا وە ك( مـەڕ)ەکـە بـەدوای کـەس نـەکـەویت, ئـەوەی کـەســـێکی تر دەیکـات بەتۆش دەکرێت بەڵام بەو شـــێوازەی خۆت, لەوەیە کەســـێکی تریش هەبێت دوای تۆ بیـەوێت هـەمـان بیرۆکـە بخـاتـەگـەڕ بـەڵام بـەشـــێوازی خۆی هـەر یەکێکیشـتان لە داهێناندان بەشـێوازی خۆتان, باشـە کـەوایـە دەتوانیـت بیر بکەیتەوە ئەوەی خەڵکێك دەیزانێـت و بیری لێ دە کـاتـەوە جیـاوازی چییـە لـەگـەڵ تـۆ؟ خـۆ تـۆش دەتوانیت بیر بکەیتەوە و ئەوە بزانیت کە دەتەوێ جیـاوازییـەکـە تـەنـهـا بەدواداچوون و تەرخانکردنی کاتە دواتر ئەزموونکردنە ئەگەر بتەوێ.



ئەوە بزانە کە ژمارە یەك یەکە و دوو دووە چونکە هەر یەکەیان لە شوێنی خۆیانەوە بە بەهای خۆیان بەهایان هەیە واتا یەك لەبەر ئەوە بەهای نییە کە ژمارە دوو بەهای هەیە بەهای یەك لەبەر بەهای بوونی ژمارە یەکە بەهای (دوو)ش لەبەر خۆیەتی واتا باســەکە لە بوونەوەیە مادام هەردووکیان هەن بەشــێوازی خۆیان هەر یەکەشـیان بەو شـێوازەی هەن بەهایان بۆ دیاری دەکرێت نە ك بەو شـــێوازەی کە ئێمە بمانەوێت( یەك )یەکە و( دە ) دەیە بۆخۆی, مادام تۆ بوونت هەیە کەواتا هەیت بۆیە دەبێت خۆتبیت خۆت بەهای خۆت دەسـەلمێنی نەوەك کەسێکیتر بەهای تۆ دیاری بکات.

بەهای بوونی خۆت بە قسە بەدیار ناخرێت بەڵکوو دەسەلمێندرێت ئەوەشــیان بەو ڕێگایە دەبێت کە خۆت دەتەوێت, خاوەنی عەقڵیت و ئـازادیت بیر دەکـەیتـەوە لـەوەوە تووشـــی لێکدانـەوە دەبیت و بەدواداچوون دەکەیت کەواتا چی شـــتێك ڕێگربێت لەوەی ببیت بەخۆت؟ تۆ ( لەبەر ئەوەی خۆتیت کەســی تر نیت, نەك لەبەر ئە وەی کەســـی تر نیت خۆتیت) بژاردەی یەکەم ئەوەیە کە خۆتبیت لەبەر ئەوەی تۆش بوونت هەیە نەك وەك دوا بژاردە ســــەیری بکەیت کە تۆ لەبەر ئەوەی کەســـی تر نیت کەوایە دەبێت ببیت بەخۆت تۆ ئێستا هەیت کەواتا نەك کەسیتر نیت بەڵکو نابێت ببیت بەکەس چونکە شـــکۆی هەر کەســـێك لە خۆبوونیەوەیە نەك شـــکۆکەی لە بوونی وەك (مادده) یەك کە هەرچۆنێك بیانەوێت بیگۆڕن و مامەڵەی لەگەڵدا بکەن بۆیە خۆت لە شـــوێنی گونجاو دابنێ و بەهای خۆت لەدەست مەدە دەستبەرداری بەهاکانت مەبە چوونکە شووناسی هەرکەسێك بەهاکەیەتی کەوایە سڵ لەوە مەکە وە کە لە لوتکەدا بیپارێزیت, هەمیشــە ئەو کەســانەی خۆیان نین دەگۆڕدرێن هەرجارەو بە شێوازێك دووتایی خۆیان پیشـان دەدەن تەنانەت سڵ لە لەدەستدانی بەهای خۆشیان ناکەنەوە بۆیە هەموو بەهاکانی تۆش لای ئەو بێ بەهان دووربە لەو کەســـانە لەوەیە ســـزای مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کەســـەی کە خۆی نییە باجەکەی

زۆر بە زیانبێت کە توانای قەرەبووکردنەوەی قورسبێت بەرلەوەی بگەیتە ئەو ئاستە خۆت پارێزراو بکە لەهەر کەسێك کەخۆی نییە وەك (بێرتراند ڕاسڵ ) بیرمەند و نوسەر و بیرکاری ئینگلیز دەڵێت: ( ناتوانین هەموو شـتێك چاك بکەین، بەڵام دەتوانین لە هەموو ئەو شـتانە دوورکەوینەوە کە میزاج و بیرمان بۆگەن دەکەن).

## شانازی بەخۆت بکە!

زۆر قورســـە بۆ یەکێك کە خۆی نەناســـێ و خووە بەدەکانی نە ناســـێتەوە و بیەوێت پەیوەندی دروســـت بکات لەگەڵ دەوروبەرە کەی تەنانەت لەسەر کار و لە خوێندن و لەگەڵ خێزانەکەشی سە رکەوتوو نابێت لە دروســـت کردنی پەیوەندییەکی دروست و بێ کێشە ئاخەر خەشـمێکی نائاســـایی هەیە لە نـــاخـــی و هـــەر خـەریکی زۆرانێیە لەگەڵ دەوروبەری یانیش گرەوێکی بێ بنەمای لەگەڵ خۆی کردووە دەشـــکرێ خۆی ون کردبێت, هیچ کەســـێکیش تا خۆی نەدۆزێتەوە ناکرێت ببێت بەخۆی چونکە خۆی نەناســـێت یانیش گەمژەیە! چونکە ئەو کاتە گەمژەیی مرۆڤ بەدەر دەکەوێت کە دەزانێت ئەو کارەی مەبەســـتییەتی خراپەیەکە و ئەگەر بیکات زیان لەخۆی دەدات هێشتان شـانازی بەوەوە دەکات کە دەیکات و خۆشـــی ئەوە دەزانێ چی کردووە و ســـەرەڕای هەموو ئەوانە هێشتان لافی پێوە لێ دەدات.



مرۆڤ ئەگەر پیرۆزی خۆی ڕانەگرێت زۆر زەلیلە (دەکەوێتە ژێر دەســـت و پێیان) زیادەڕەوی بەرامبەر دەکرێت و هەمیشـــە خۆی بە پاشـــکۆ دەبینێت و لە شـــوێنێکی چۆڵیشـــی دابنێ پەنا بۆ

هەموو شـــت دەبات بیکاتە ســـەرداری خۆی ئاخەر دووچاری لەدەستدانی خۆی بووە! ئای چەندە گرانە ڕۆژگار بۆ ئەو کەسەی خۆی لەدەست داوە زۆر قوڕس دەژیت ئەو کەسەی خۆی لێ ون بووە و بە بچوکی خۆی دەبینێت هەرچەندی تەماشـــای خۆی دە کات هەر بچوکە و گەورە نابێت و هێدی هێدی بچوك دەبێتەوە چونکە نایەوێت خۆی بدۆزێتەوە نایەوێت شانازی بەخۆی بکات و وادەزانێـت ئـەوەتـەی لـە دایـك بووە بۆی نوســـراوە (نـابێـت گەورەبیت) وەك ئەوەی ترسێندرابێت لە گەورەبوون.

مەترســـە لەوەی خۆتبیت مەترســـە لە چاکە کردن مەترســـە لە گەورەبوون مەترسـە لە قسـەی باش و ترسـت لە بەرەوپێشـچوون نەبێت هەنگاو بهاوێژە بەرەو سـەر بەجۆرێك کە شـانازی بەخۆتە وە بکەیت و بوەستیت لەپێناوی خۆت و هەناسـەیەکی قوڵ هەڵمژە و دەســـت خۆشـــییەك لەخۆت بکە و ئیتر بەردەوامبە چونکە بەبێ بەردەوامی نە پێشـکەوتن و نە سـەرکەوتن بوونیان نابێت شـایەنی ئەوەیت کە دەســـت خۆشـــی لەخۆت بکەیت چونکە بەردەوامی و خۆتت دۆزیوەتەوە مەزنی خۆتت پاراســـتووە و ڕێزت لەخۆت گرتووە, ئەی ئەو کەســـەی بەدوای خۆتدا دەگەڕێیت و وێڵی بەدوای دۆزینەوەی خۆتدا و دەتەوێت ببیت بەخۆت پەیوەندییە کانت ڕێك بخەوە شـــانازی بەخۆتەوە بکە لەمەوبەدوا و ژێردە ستەی هیچ کەسێك نیت, ئیمامی (عەلی کوڕی ئەبووتاڵیب) ئامۆزا و زاوای پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) و خەلیفەی چوارەمی موســـڵمانان دەڵێت: (نە مەرگ هێندە ترســـناکە و نەژیانیش هێندە شـیرینە تا کەرامەتی خۆت لەپێناویاندا لەدەست بدەیت) ژیربە بە وەی هەســـت بەخۆت بکەیت چونکە لەوانەیە ڕۆژێك بێت درەنگ بێت بۆ ئەوە وریابە و خۆت بدۆزەوە شـانازی بەخۆت بکە چونکە تۆش هەیت.

وریابە نەکەویتە هەڵەوە چونکە لەدوای وێسـتگەی سـەرکەوتن و هەوڵەکان پشـووی شـانازی و دەسـت خۆشـــی هەیە نەوەك لاف لێدان و بەخشـینەوەی منەتباری بەسـەر کەسـانی تر تاکە شـتێك لە

ســەرتە ئەوەیە دەســت خۆشــی لەخۆت بکەیت بەوەی کە شــانازی بەخۆت دەکەیت, چونکە ئەوەی بەردەوامە لەگەڵت وەك و ناوت لەگەڵتە ڕەفتار و کەسایەتیتە بەهیچ دەستکەوتێکی ماددی و ڕووکە شــەوە نەکەویتە هەڵەوە ئامانجەکەی تۆ بەخشـینەوەی لاف نییە بە کەس بەڵکوو دەست خۆشی کردنە لەخۆت چونکە هێزی شانازی بەتۆ دەبەخشـــێت و دڵنیات دەکاتەوە کە ئەوەی کردووتە بژاردە دروستەکەبووە.

## میتۆدی عەشق بۆ بوون بە خۆت بەکاربێنە!

عەشق چۆن دروست دەبێت و چۆن بەردەوام دەبێت؟

وەك دەوترێ عەشق لە یەکەم دیدارەوە دروست دەبێت بەڵام پرسیارە جەوهەرییەکە ئەوەیە ئایا یەکەم بینین و بەریەککەوتن بەسە بۆ ئەوەی عەشق دروست ببێت؟



پراکتیزە کردن و دووبارە کردنەوەی کۆمەڵە شتێك پەیوەندی نێوان عەشق و مەعشوق بەهێز دەکات, لەوانە دروستکردنی پەیوەندی رۆژانە لە ڕێگای بیستن بێت یان بینین و قسەکردن و بەریەککەوتن بێت ئەگەر ڕۆژانەش نەبێت پێویستە بەردەوامی پێ بدرێت بۆ ئەوەی ئەو عەشقە بەردەوامبێت و سەرەنجام بەرهەمێکی هەبێت جا ئەو عەشقە لە نێوان هەردووك رەگەزدابێت یان شتێکی ماددی و بەرجەستەیی بێت وەك کتێب و خوێندن و کار...هتد هەموو ئەوانە بەردەوام دەبن لە ڕێگای بەستنی بەردەوامی پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسەدا یان ئەو شتەدا, لە هاوڕێیەتیشدا هەمان باسە و جیاوازی نییە ئەگەر هاتوو پەیوەندی هاوڕێیەتی کاتی بوو و دوای ماوەیەك تووشی دابڕان بوون و پەیوەندییەکە پچڕا کێشە دروست دەبێت لەو پەیوەندییەدا, وە لە هەر هەموو ئەو عەشقانە گەورەتر عەشقی بەندە و خودای گەورەیە, ئەو کاتەی حەزدەکەیت خودای گەورە قسەت لەگەڵ بکات قورئانی

پیرۆز دەخوێنیتەوە ئەوکاتەشـــی دەتەوێ قســـە لەگەڵ خودای گەورەدا بکەیت نوێژ دەکەیت, ئەگەریش ویستت لەخودای گەورە نزیك بیتـەوە کڕنوشـــی بۆ دەبـەیت, پـەیوەندیت لـەگـەڵ خودای گەورەدا بەهێز بکە عەشـــق و خۆشـــەویســـتی و خۆشـــبەختی ڕاستەقینە عەشقی خودای گەورە و پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ) لەبەر ئەوەی هەموو خۆشەویستیەک خۆشی و ناخۆشی تێدایە, تەنها ئەو خۆشەویستییە نەبێت هەمووی خۆشیە.!

چۆن ســـوود لە میتۆدی عەشـــق وەربگرین بۆ بەردەوامیدان بە پەیوەندی خۆمان لەگەڵ خودی خۆمان و ئەو پەیوەندییەی ناخ و مێشـکی خۆمان بەهێز بکەین, بەکارهێنانی میتۆدی عەشـقی خود دەتگەیەنێت بە ئارامی بەڵام بەبێ زیادەڕەویکردن چونکە لەوانەیە زیادەڕەویکردن لێی توشـی لەخۆبایی بوون و خۆپەرستیت بکات, ئایا چۆن ئەو پەیوەندییە دروست بکەین لەگەڵ خۆمان و پەیوەندی خۆمان لەگەڵ خۆماندا بەهێز بکەین؟

وەڵامەکە ئەوەیە پتەو کردن و بەهێزکردنی پەیوەندی خۆتە لەگەڵ خۆت(جەلالەدینی رۆمی) دەڵێت: (هەســـت بە تەنهایی دەکەیت، لەبەر ئەوە نیە کە تۆ تەنهایت بەڵکو لەبەر ئەوەیە تۆ لە ناخی خۆت یان لە خودی خۆت دوورکەوتویتەوە) مێشـك و ســـەرجەم ئەندامەکانی تری جەستەت ئەمانەتن بەدەستی تۆوە تۆ بەرپرسی لە ئەندامەکانی جەســـتەت ئەوە پێویســـتە لەســـەرت گرینگیان پێ بدەیت چونکە ئەوان پێویستیان بەتۆیە تا تووشـی سـەرلێشـێواوی نـەبن و بـەپێی پلان و ویســـتـەکـانی تۆ کـاربکـەن نـەوەك بـەبێ بەرنامەیی و بەبێ ڕێکخســـتن, چونکە ئەوە وادەکات دەروونێکی لاواز و ناتەندروسـتت هەبێت زوو توشـی شـکان و کەوتن ببیت, ئەگەر دەتەوێت خۆت بەرەو پێش ببەیت و ســـەرکەوتووبیت و ببیت بـەخۆت, پـەیوەنـدی خۆت لـەگـەڵ خۆتـدا بـەهێز بکـە پێش خەڵکی ئەوەش بە قسەکردن لەگەڵ خۆتدا کە دەتەوێت چی بکەیت و بـەرەو کوێ دەڕۆیت؟ ئـایـا خـەریکی چیت؟ کـاتـەکـانـت بـەچی بەڕێ دەکەیت؟ســـوود لە کات وەردەگریت بۆ پێگەیاندنی خۆت

یان نا؟ پرســـیار لەخۆت بکە و وەڵامی خۆت بدەوە گوێ لەخۆت بگرە بزانە چیت دەوێت و حەز دەکەی چی بکەیت چی شـــتێك لە ســـوودی تۆیە و چی شـــتێك دژ بە بەرژەوەندی خۆتە پەیوەندی خودی خۆت بەهێز بکە لەگەڵ خۆتدا تا دواتر پەشـــیمان نەبیتەوە لـەو کـارانـەی ئـەنجـامیـان دەدەیت و بتوانیت بـەکـەمترین هـەڵـە زۆرترین دەستکەوت بەدەست بێنیت, دوای جێبەجێکردنی میتۆدی عەشق بۆ بوون بەخۆت تێدەگەیت کە سوودی چییە و ئەنجامەکانی دەبینی.

وە پێویســـتە هەریەکەمان ئەوەش بزانین بەرپرســیارین بەرامبەر هەریەك لە ئەندامەکانی جەســـتەمان ئەگەر بۆ کاری خراپە و بێ سوود و دەستکەوت بەکاریان بێنین لە ڕۆژی دوایی سکاڵامان لە ســـەر دەکەن لەلای خودای گەورە, بۆیە پێش ئەوەی دەرفەتەکان لەدەســـت بدەیت بیرێك لەخۆت بکەوە و برەو بە بەهێزکردنی ئەو پەیوەندییە بدە, خودای گەورە لە ســـوڕەتی (یس) فەرموویەتی: (الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْـــهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ) )٦٥) واتا: کافران و مونافیقان نکوڵی کوفرو تاوانیان دە کـەن، خـوای گـەورە دەفـەرمـوێت: ئـەمڕۆ مۆر ئـەدەین لـەســـەر زمانیان کە نەتوانن قســـە بکەن، وە دەســـتەکانیان دێنینە قســـەو قســـەمان لەگەڵدا ئەکەن، وە پێیەکانیان شـــایەتیان لەســـەر ئەدەن، بەهۆی ئەو تاوانانەی کە لە دونیا کردوویانە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت (لە رۆژی دوایی بەندەیەك گفتوگۆ لەگەڵ خوای گەورە دەکات و دەڵێت من تەنها شـــایەتێکم دەوێت کە شـــایەتیم لە سەر بدات لە نەفسی خۆم بێت، خوای گەورە رازی دەبێت و مۆر لەســـەر دەمی دەدات و بە ئەندامەکانی دەفەرموێت بێنە قســـە، ئەوانیش دێنە قسەو شایەتی لەسەر دەدەن) بۆیە عەشقی خۆتبە و خۆتت خۆشـــبوێت و بەردەوام لە پەیوەندیدابە لەگەڵ خۆتدا نەبادا ون ببیت.

# گزگڵ و کۆیلە!

بەپێی هەر بارودۆخ و سەردەم و شوێنێك کۆمەڵە بەهایەکی باڵا و بەرز چ لەسەر ئاستی ئایینی یان کۆمەڵایەتی یان کلتوری و هتد... داندراون وپێویستە مرۆڤ لەو چوارچێوەیەدا ڕێز و وەفا و خۆشەویستی لە پێشەنگی بەها بەرزەکانەوە ببینێت و کاری پێ



بکات, هەروەها برەودان بە داهێنان لە ڕەوشت بەرزیدا کە لە ئامانجی تاکی خاوەن کەسایەتییە لە پێشینەی کارەکانەوەیە, مرۆڤە کان ڕاستییەکیان هەیە کە هەروا ئاسان نابینرێت و بەرچاو ناکەوێت تەنها لە ڕێگای مامەڵەکردنیان لەگەڵ کەسانی خوار خۆیانەوە نەبێت.

ئازادی تاك تا ئەو کاتەیە کە دەستدرێژی نەکاتە سەر کەسانی دەوروبەری ئەوەشیان بە چەند شێوازێك ڕوودەدات لەوانە( بێهیوا کردن, بەکەم سەیرکردنی کەسێك یان کارەکەی, سوکایەتی پێکردن و خواردنی مافی کەسانێك...هتد) هەموو ئەوانە بریتین لە

دەســـتدرێژی کردن بۆســـەر ســـنوری تاك باشـــە کەوایە چۆن پارێزگاری لەو سنورە بکەین هەم بەرامبەر بە خۆمان و بەرامبەر بە کەسانی تر؟.
ئەو کاتە دەبیتە گزگڵ کە کارە باش و خراپەکان ئاکارە بەرز و بێ نرخەکانت لە یەکتر جیا نەکەیتەوە و خراپتر لەوە ئەو کۆیلەیەیە پاڵپشـــتی لە گزگڵێك دەکات, گزگڵ ئەو کەســـەیە خۆی دەربخات و گەورەیی خۆی لە بچوککردنەوەی کەسێکی تر ببینێت لە ڕاســـتیشـــدا بێ خەبەرە لەوەی خۆی بچوکتر دەردەخات, کەسایەتی مرۆڤ ئەوکاتە دەڕوشێت کە (خۆی بە گەورە بزانێت و گەورەیی خۆی نەزانێت) واتا ڕوشـــاندنی کەســـایەتی خۆت لە بەگەورە زانینی خۆتدا و بەرزبینینی خۆت لە ئاستی کەسانی تردا و ســـەپاندنی خۆت لەکاتێکدا لە پیاوێکی گزگڵ هیچی تر نیت و لە چاوێکی بێ ئاگاوە خۆت دەبینیت ئەو بێ ئاگاییە هەتا درێژە بکێشـێت بچوکترت دەکاتەوە, بەهەمان شـێواز و کاریگەری ئەو کەسەی گزگڵێك دەکاتە گەورەی خۆی و لە ئاستیدا هەمیشە دەنگی کز و سەری نزم و جوڵەی لەرزۆك پیشان دەدات نزمتر لە ئاستی گزگڵێك کۆیلەییە, بۆیە بە کورتی خۆبەگەورەزان و لوتبەرز و لەخۆبایی بریتییە لە نزمی ئاســـتی کەســـایەتی و خســـتنەڕوو و پیشاندانی ئەو ڕاستییە و ئەو کەسەشی خۆی بە بچوك دەبینێت لە ئاستی گزگڵێك کۆیلەیە, هەرکەسێك و کەسایەتییەکی تایبەتمەندی بەخۆی هەیە تەنانەت گزگڵێکیش کەسێتییەکی هەیە بەڵام کەسێتییە کەی نە نرخی هەیە نە بەها و کۆیلەش نەك هەر کەســـێتییەکەی نرخ و بەهای نییە بەڵکو بێبەشە لە بوونی کەسایەتی.
واز لە "بژی بژی" بهێنە و خۆتبە چیتر واز لە گەورەکردنی کە ســـە هەناو پوچ و کەم بایەخەکان بهێنە ( ئەدۆنیس) شـــاعیر و ڕۆشنبیری ناوداری عەرەبی وڵاتی سوریا دەڵێت: (تۆ ڕقت لەمن نیە بەڵکو ڕقت لەو وێنەیە کە لە مێشـــکی خۆتدا لەســـەر منت دروســـت کردووە, بەڵام لە ڕاســـتیدا ئەو وێنەیە من نیم بەڵکو خۆتیت) بەهەمان تێڕوانین بە ئاســـتی ئەو خۆ بەگەورە زانی و

هێندەی ئەو بە بچوك سەیرکردنەی کەسی بەرامبەر کەسایەتیت تەسك و لاواز و بچوك دەبێتەوە, ئەوە وەك ئەوە وایە کە لەخەوی غەفڵەتدابیت و بێ ئاگابیت لەوەی هێدی هێدی خەریکە کەسایەتیت تێك دەشکێنی و دوور دەکەویتەوە لە ئاستی گەورەیی بوون بەخۆت و لاواز دەبیت بە قەبارەی گەردیلەیەك سەنگینیت نامێنێ و هێندە لاواز دەبیت لە ئاستی کەسایەتیت مەگەر تەنها بە گەڕانەوە بۆ چوارچێوە گەورەکە کاربکەیت بۆ گەڕاندنەوەی ئەو سەنگە, چوارچێوە گەورەکەش بریتییە لە ڕێزگرتن لەهەموو کەس و چینێك و ڕەگەز و بیر و ئایدیا جیاوازەکان.

**باوەڕ بەخۆبوون کلیلی سەرکردایەتی خوودە!**



ژیان زۆر جوانتر و ئاسـانتر و بەچێژتر دەبێت ئەوکاتەی خۆت دەناسـیت و لـەپێناوی خۆتدا سەرکردایەتی خۆت دەکەیت, تا ئەو کاتەی خۆت نەناسیت و هە سـت بە بوونی خۆت و تواناو لێهـاتوویی خۆت نـەکـەیت و سـەرکردایەتییەکی دروسـتی خۆت نەکەیت ناتوانیت لەهیچ بوارێکی ژیانتدا ببیت بە سـە رکردە و بـەرپرسـیـاریـیـەتی هـەڵگریـت چونکـە هـەڵگرتنی بەرپرسـیارییەتی پەیوەندییەکی ڕاسـتەوخۆی هەیە بە باوەڕ بەخۆبوون کە کلیلی سـەرکردایەتی خودە هەموو ئەوانە پێکەوە بـەسـتراون بۆیـە تـا ئـەو کـاتـەی بـاوەڕ بـەخۆت نـەکـەیت و سەرکردایەتی خۆت نەکەیت ناتوانیت بەرپرسیارییەتی بگریتە ئە ستۆ.

بەرپرسـیارییەتی گەورە لە ئەسـتۆی هەر کەسـێکە کە دەیەوێت بژیت هەڵگرتنی بەرپرسـیارییەتیش پێویسـتی بە سـەرکردایەتی خوود هەیە چونکە مرۆڤ ئەو کاتەی سـەرکردایەتی خۆی کرد هیچ کەس و قسـەیەکی نەرێنی ناتوانن سـاردی بکەنەوە لە هەنگاوەکانی و ئەوە دەکات کە دەزانێت دەبێت بیکات نەوەك ئە وەی کە خەڵکی دەیانەوێت.

جیهان پێویستی بە کەسێك نییە کە نەتوانێت خۆی بەڕێوەبەرێت و ببێت بە بارگرانی بەسـەر کۆڵی کەسـانێکی ترەوە چونکە ژیان زۆر لەوە قوڕسـترە کە کەسـێك کە نایەوێت بەرپرسـیارییەتی هەڵبگرێت و چاوەڕێی ژیانێکی ئاسـان و بێ بەرز و نزمی دە

کات, بەڵێ ژیان قوڕسە بۆ کەسێك کە بەرپرسیارییەتی هە ڵنەگرێت بۆ کەسێك نەخۆی دەناسێت نەدەزانێت چی دەوێت هەمیشە ئەوانەی کە نازانن چیان دەوێت کەسانێکی بێ بەرهەمن و مشەخۆرێکن کە لەبری بەزەیی پێدا هاتنەوە پێویستیان بە دەست گرتن هەیە, ئەو کاتە کەسێك شایەنی بەزەیی پێدا هاتنەوەیە کە نەبیەوێت خۆی بناسێت و نە بەرپرسیارییەتیش هەڵبگرێت لەهەمووشی سەیرتر ئەوەیە خۆی بە سەرکردە بزانێت, تۆ ئەگەر باوەڕت بەخۆت و بەوە هەیە کە دەتەوێت بیکەیت دڵنیابە لەوەی جیهان پێویستی پێتە چونکە تۆ سەرکردەیت, چونکە خۆتیت, بۆیە دەتوانیت کاریگەریش دروست بکەیت و شوێن پەنجەی خۆت لەهەر شوێنێك بەجێ بهێڵیت.
باوەڕت بەخۆت و بەوە هەبێت کە دەتەوێت بیکەیت سەرکردایەتی خۆت بکە لەپێش هەموو شتێکەوە دواتر کە ئەنجامتدا دەتوانیت هەنگاوی دواتر دەستنیشان بکەیت, لە باوەڕ بەخۆبوونەوە سەرکردایەتی خوود بەدەست بێنە و لە سەرکردایەتی خوودەوە خۆشەویستی خەڵك بەدەست بێنە و لە خۆشەویستی خەڵکەوە کەسایەتی بەهێز بەدەست بێنە لەهەموو ئەوانەوە هێز بەدەست بێنە, هەمیشە هەوڵ بدە واقیع ببینەو شێوازی بیرکردنەوەو گوفتارو ڕەفتارەکانت بە شێوەیەکی تەندروست ڕێك بخەیت لەگەڵ پەروەردە کردنی هەستو تایبەتمەندیەکانت بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بیت لە سەرکردایەتی کردنی خۆتدا.

## فێربە بڵێیت نازانم!

مەرج نییە وەڵامی هەموو پرســـیارێك لەلای تۆبێ, مەرج نییە وەڵامی هەموو پرسـیارێك بدەیتەوە چونکە هەرگیز هیچ کەسـمان هەموو شـــتێك نازانین مێشـــکی مرۆڤ ســـنوورداره ناتوانێت کۆنترۆڵی هەموو زانیارییەك بکات کە دەیبیســـتێت و دەیبینێت و هەســـتیان پێ دەکات,



بەتایبەت مرۆڤی ئەم سـەردەمە کە هەمیشـە مێشـــکی جـەنجـاڵـە بـاشـــترە بڵێیـت کـە نـــازانـــم لـــەوەی زانیـاریـیـەکی هـەڵـە بگـەیـەنی ئـازایـەتی بچوك مەکەوە لەوەی وەڵامـــی هـــەمـــوو پرســـیارێك بدەیتەوە خۆت لە هەموو شتێکە وە هەڵبقورتێنی, قسـە لە هەموو باســـێك بکەیت, قســـە کردنی زۆر مانای ئەوە نییە کە هەموو شـتێك دەزانی, تا ئەوەی کەمتر قسـە بکەیت و زیاتر گوێ بگریت کەمتر هەڵە دەکەیت و زیاتر فێردەبیت, قســەی زۆر زوو لەبیر دەکرێت قســەکانت با کاریگەریان هەبێت و شــوێنی خۆیان بگرن.

پێچەوانەی قسەکردنی زۆر کەم قسەکردنیش هەڵەیەکە خۆتی لێ بپارێزە چی دەزانیت ئەوە بڵێ دەربارەی هەرشـــتێکیش نازانی پرسـیار بکە شــەرم لە پرسـیارکردن مەکە بەڵکو شــەرم لەوە بکە شتێك کە دەتەوێ بیزانی و پرسیاری لێ ناکەیت, (مالکوم ئاکس) بانگخوازی ئیســـلامی ئەفریقی-ئەمریکی و پارێزەری مافەکانی مرۆڤ دەربـارەی مرۆڤی نـەزان پـەیڤێکی جوانی هـەیـە دەڵێت :

(گەورەترین کێشەی نەزانی ئەوەیە نازانێت کە نەزانە) درك بەوە بکە کە چی دەزانیت و قوڵبەوە لەوەی پرسیاری چیت ئاڕاستە دە کرێت ئەوکات بە وریاییەوە وەڵام بدەوە, ئازایەتی ئەوە نییە لە دانیشتن و کۆبونەوەیەکدا زۆرترین قسە بکەیت و یارمەتی کەس نەدەیت لەوەی قسەکانی تەواو بکات و پێش هەموو شت فێربە کە گوێبگریت, دواتر فێربە کە وەڵامی هەموو پرسیارێك نەدەیتەوە و لە هەموو بابەتێکەوە قسە نەکەیت ئەوکاتە ئازایەتی لەخۆتدا دەدۆزیتەوە کە بوێری ئەوەت تێدا هەبێت کە پرسیارێکت لێکرا و زانیاریت نەبوو بڵێیت کە نازانم ئازایەتی لەوەدایە کە زانیاری هە ڵە بەکەس نەگەیەنی و قسە لەسەر هەموو بابەتێك نەکەیت کە دەربارەیان نازانی شیکردنەوە بۆ هەموو شتێك مەکە و مەچۆرە نێو هەموو بابەتێکەوە تا بە خراپ بەسەر خۆتدا نەشکێتەوە و کەس بە هەڵەدا نەبەیت, دکتۆر(عەلی شەریعەتی) نوسەری وڵاتی فارس دەڵێت: (گەورەترین پلەی ئازایەتی وتنی ڕاستییە کانە,لە کاتێکدا کە حەقیقەت لەبەرژەوەندی تۆدا نەبێت).

## شەرمنی هۆکاری بەدبەختییە!

زۆربەی ئەو کەســـانەی کەمترین دەســـتکەوتیان هەیە ئەوانەن دەترسن لەوەی بترسن! ترست لەشەرم کردن و ترسانت لەبەردەم مـامۆســـتـاکـەت بـەڕێوەبـەرەکـەت خـاوەن کـارەکـەت لـەبـەردەم هاوڕێکانت لە خودی ترس گەورەترە, کاریگەرن لەسەر دەربڕینە کانت هۆکارێکن بۆ ئەوەی هەلەکانت لەدەســت بدەیت, پێش ئــەوەی شـــتــەکــان ڕوویـان دابێـت ئـەگـەر و گومانی بۆ دادەنێیت ئەوەش هۆکـارێکـە لـەوەی ترس و شـــەرم داتبگرێت زاڵبە بە ســەر شــەرمکردن دەگەیت بە زۆربەی ئەو شـــتانەی هەوڵیان بۆ دەدەیت چونکە ژیـان زۆر لــەوە کورتترە کە هەســت و ویســتەکانتی تێدا بشاریتەوە, شەرم مەکە و شــەرم لە چی دەکەیت ئە وە بکە بەڵام ئەوەت لەبیربێ بە شێوەیەکی تەندروست و ژیرانە هەستەکانت دەربڕە بـا نـەبن بـە مـایـەی زیـان بۆخۆت ئەوەی پێویســتە تە نها ئـەوەیـە ڕاهێنـانیـان لـە سەر بکەیت.



مەترســە لەوەی هەڵە دەکەیت هەڵەکان فێرت دەکەن هەڵە نەکەیتە وە ئەگەر هەڵە نەکەیت فێرنابیت, بەرەو پێش ناچیت, بۆ هەر هەنگاوێك دوو ئەگەر هەیە یان ئەوەتا پێش دەکەویت یان دە

کەویت ئەوە لە مێشکی خۆتدا بچەسپێنە کە براوە دەبیت خۆ ئەگەر کەوتیشـــی بە ئازایی هەســـتەوە و هەوڵی خۆت بدە, (ئەلبێرت ئەنیشـتاین) زانای بەناوبانگی ئەڵمانی لەبواری فیزیا و بوارەکانی تری زانسـت دەڵێت: ( ئەو کەسـەی کە هیچ هەڵەیەکی نەکردووە, ئەو کەسـەیە کە تا ئێسـتا هیچ شـتێکی نوێی تاقی نەکردووەتەوە)
شـەرم لە هەر شـتێك دەكەیت تاقی بكەرەوە بەرەو ئەو ئاڕاسـتەیە بڕۆ کە شـــەرمی لێ دەکەیت ناکرێ تا کۆتایی ژیانت نەچیت بەو ڕێگایەی کە دەتەوێ تاقی بکەیتەوە لەبەر ئەوەی شـــەرم دەکەیت, لەبەر ئەوەی هیچ شـــتێك مەحاڵ نییە دەتوانیت بیکەیت ئەنجامی دەدەیت, تەنها ئەوەی لەســـەرتە ئەوەیە ڕووبەڕووی ببەرەوە لە ســـەر بچوکترین هەنگاو پاس مەدە لەبەر ئەوەی شـــەرم دەکەیت ئەنجامی بدەیت گرینگ ئەوەیە شـــتێکی نوێ فێردەبیت (عەلی کوڕی ئـەبی تـاڵیـب) چوارەم خـەلیفـەی ڕاشـــیدین دەڵێـت: (لـە بەخشـینی کەم هەرگیز شـەرم مەکەن, نەبەخشـین لەو کەمترە) لە ســـۆنگەی ئەم وتەیەوە هەر هەنگاوێك هەر هەڵێك هاتە ڕێت بیگرە و بەری مەدە ئەگەر هەنگاوێکی بچوکیش بێت لەوە باشترە هیچ هـەنگـاوێك بـەرەو پێشـــەوە نـەچیت دواتر هـەســـت بـە خەسارەتمەندی خۆت دەکەیتەوە لەوانەیە زۆر شت ئێستا بتوانی بیکەیت بەڵام شەرم ڕێگربن لەبەردەمت خۆ ئەگەر شەرم دەکەیت ئەوەش بزانە لە داهاتوو حەســـرەت بۆ ئەو ســـاتانەی ئێســـتا دەخوازیت, بۆیە بەر لە پەشیمان بوونەوەت دەستبەرداری ببە!.
ئەو هەلەی ئێسـتا لەبەردەمتە لەدەسـت خۆتی مەدە ئەوە بکە کە دە تەوێ تا توشـی ئاسـتەنگ نەبی و بتوانی بگەیت بە ئاواتەکانت و دەسـتکەوتی زیاترت هەبێت, ئەگەر شـەرم لەوە دەکەیت لەبەردەم هاوڕێکانت سـیمینارێك پێشـکەش بکەیت بێ دوودڵی سـیمینارێك ئامادە بکە و پێشـــکەشـــی بکە لەوەیە ســـبەی بۆ کۆمەڵە خەڵکێکی بێگانە قسە بکەیت ئەوکات باشتر ئامادەگیت تێدایە بۆ هەر شتێکی تر, زاڵبە بەســـەر هەســـت کردنت بەشـــەرمنی و تاقیان بکەوە

تێدەگەیت هیچ شـــتێك جێگای شـــەرم كردن نییە لە چوارچێوەی سنوری خۆی بێ زیادەڕەوی.
هاوكاری كەسـانی شـەرمنبە هانیان بدە كە شـەرم نەكەن هەوڵیان لەگەڵدا بدە و بابێن لەلات قسـە بكەن شـەرمەكەیان بشـكێنە بەوەی بە فیزیكی لەبەردەم خۆت قسە بكەن, گاڵتە بە هەڵەی هیچ كەسێك مەكە ئەو كەسـانەی خۆیان شـەرمنن مەیان شـكێنەوە هاوكاریانبە بەســـەر شـــەرمەكەیان زاڵبن لەوانەیە یەك گاڵتە پێكردنی تۆ بە كەسـێكی شـەرمن وابكات تا ئەبەد هەوڵ نەداتەوە بۆیە ئاگاداربە كە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەیت چونكە شـــەرمنی دۆخێكی كاتییە و بەپێی كات و هەوڵی كەسەكە كاڵ دەبێتەوە بۆیە سارديان مەكەنەوە هاندەریان بن.

## پێشکەوتن و سەرکەوتنە گەورەکان
## پشوو درێژیان دەوێ...



ئارامبەخشترین و خۆشترین ساتەکان کە مرۆڤ دڵی پێی ئاسودە دەبێت ئەو ساتانەن کە هەست دەکات لە ئامانج و هیواو ئاواتەکانی نزیك بۆتەوە و خەریکە پێیان دەگات, ئارامبەخشتر و خۆشتر لە وە ئەو ساتەیە کە گەیشتوە بە ئامانج و خەون وئاواتەکانی, ئەوە بەخششێکی خودای باڵادەستە کە یارمەتیدەرمانە لەوەی لە دونیا بەبەشێك لە ئارەزوەکانمان بگەین.

ڕەنگە هەم عەقڵ و هەم دڵ و هەمیش جەستە بەرگەی گۆڕانێکی گەورەی لەناکاوی ژیانت نەگرن و نەتوانی بەباشی مامەڵە لەگەڵ بارودۆخەکاندا بکەیت پێش هەموو شت پێویستت بە ئامادەباشییە و ئامادەگی تەواوت تێدابێت بۆ هەر گۆڕانێك لە کار و ژیان و گوزەراندا, بۆیە هەرگیز لە هەوڵی ئەوەدا مەبە یان لەمێشکی خۆت دایمەنێ کە زۆر بەخێرایی بگەی بە شتێك کە کات و ڕەنج و ماندووبوونێکی زۆری پێویستە و لەناکاوێك وەك (فانۆسەکەی عەلی بابا) لەچاو تروکانێك دێوێك هەموو ئەوانەت بۆ بەردەست

بخات چوون ئەوە ساردت دەکاتەوە لەوەی هەوڵ بدەی و کاریگەری لەسەر دەروون و جەستەت بەجێ دەهێڵێ, وادەکات هەست بە بێهیوایی بکەی لەوەی کە چاوەڕێت دەکرد ئەوە نەبوو یان ڕێگایەکی زیاترت ماوە لەوەی کە بڕیوتە, ئەوەت لەبیربێت هەوڵی ئەوە مەدە بەچاو تروکانێك لەخاڵی سەرەتاوە بگەیت بە کۆتا خاڵ ئەوە لە خەیاڵێکی بێ بایەخ زیاتر سوودێکی بۆت نابێت.
لەوەیە ئێستا بڵێی باشە ئەی چارە چییە و چی بکەم؟
باشترین کار کە بیکەیت ئەوەیە دڵنیا بیتەوە لەوەی دەتەوێت چی بکەیت ئەوکاتەی ئامانجێکی دیاری کراوت هەبوو ئاڕاستەی ڕێگاکەشت بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەوەش نیوەی ڕێگاکەیە, هە ندێکجار ماوەیەکی درێژت پێویستە بۆ ئەوەی بگەی بەخاڵی کۆتایی و ڕەنگە چەند ساڵێك بخایەنی تا دەگەی بەو ساڵە کە ژیانت تێیدا دەگۆڕێت و هەست بە ئاسودەیی دەکەیت لەوەی ماندووبوونەکەت بەفیڕۆ نەچووە, بۆیە پشوودرێژی و ئارامگری و بەهێزیت لەڕێگای گەیشتن بە ئامانجەکانت ئاسانکارییەکە بۆخۆت و یارمەتیدەرت دەبێت لەبەردەوام بوونت بەو وێستگەیەی کە دەتەوێت پێی بگەی.

## ناتوانیت سەرکەوتوبیت
## ئەگەر نەتوانیت لە مێشکی خۆتدا براوەبیت!

هەوڵدە لەمێشـــکتدا ئەو جەنگە ببەیتەوە تا باوەڕ بەخۆت بهێنی کە دەتوانیت ســـەرکەوتووبیت بەســـەر هەموو لەمپەرەکان, ترســـت نـەبێت لـەوەی ئـایا براوەی یاخود نـا چونکـە ترســـەکان تـەنها خـــەیـــاڵێکن بێ هودە خۆت غـەمبـار مـەکـە بڕوای تـەواوت بـەوە هەبێ کە دەتوانی ســـە رکـەوتووبیـت و ئـەوە بکە کە دەتەوێ ترسـت لـە بـەدەســـت هێنـانی ئامانجەکەت دوورت دە خـاتـەوە لـە بـەدەســـت هێنـان و گـەشـــتن بـە ئامانج و خەونەکانت, دەســـت بەرداری ترس ببە بۆ ئەوەی بگەی بە وەی کـــە دەتـــەوێـــت بگـەیت پێی, (مـاهـاتمـا گاندی) ڕێبەری ڕۆحی هیندۆســـەکان و هێمای ئازادی وڵاتی هیندستان دەڵێـت: (بڕواکـانـت دە



بنە بیرکردنەوەکانت, بیرکردنەوەکانت دەبنە ووشـــەکانت, ووشـــە کانت دەبنە کردارەکانت, کردارەکانت دەبنە خووەکانت, خووە کـانـت دەبنـە بـەهـاکـانـت) بـەهۆی کـاریگـەرییـە لاوەکییـەکـانـەوە زۆربەی کات لە هزری خۆتدا بڕوات وابێت چی دەبێت هەر ئە

وه دەبێت, کاتێك له مێشــــکی خۆتدا وای دادەنێیت دۆڕاویت ئەوه وادەکات مێشکت ئاماژه بۆ هەموو ئەندامەکانی جەستەت بنێرێت کە سەرناکەویت, ئەو کاتەی نەخۆشــی کۆڕۆنا (Covid-١٩) و (Covid-٢٠)و نەخۆشـــییه گواســـتراوەکانی تر هاتن هەموو دکتۆرەکان له جیهان هاواریان بۆ ئەوەبوو ورەتان بەرز بکەنەوە تا بەرگریتان بەهێز بێت له دژی نەخۆشـــییەکه زۆربەی ئەوانەی ترسـیان هەبوو دەترسـان لەوەی بمرن دەمردن بەداخەوە, چونکه ئەوەیان له مێشـــکی خۆیان دانابوو کە دەمرن ورەیان دەڕووخا و بەرگری جەستەیان لاواز دەبوو ئەوەش پێمان دەڵێت "هەمووکات به ئەرێنی بیر بکەوه تا ئەنجامەکانت ئەرێنی بن", وەك ئەوەی دکتۆر(هۆرجۆن) دەڵێـت: ( بڕوای نـەخۆش بۆ چـاکبونـەوه لـه هەموو دەرمانێك باشـــتره) له کۆتاییدا ئەوەی ڕوو بدات ئەوه باشـــترینه مادام خودا بۆمانی دەهێنێت هەر ئەوه باشـــترینه و باوەڕت بەوەبێ کە خودا سەرت دەخات.

هەرگیز گرینگی بەوه مەده کە دەفرێکی پڕت هەیه یان نیوه خاڵی گرینگ ئەوەیه دەفرێکت هەیه و شتێکی تێدایه, هەوڵده شتەکان به توانـای خۆت بـەدەســـتی بێنیت خۆت هـەوڵی بۆ بـدەیت خۆت ڕێگاکان بدۆزەوه پشت بەخۆت ببەستە بۆ ئەوەی براوەبیت نەبادا به لاوازی دەرکەویت.

لەوەوه دەستپێبکه کە ئێستا هەته و بڕوات بەخۆت هەبێت لەبەر ئه وەی کلیلی ســــەرکەوتن بڕوا بەخۆبوونه تا ئەو کاتەی بڕوات بـەخۆت نـەبێت کـه دەتوانی براوه بیت براوه نـابیت, بگـەڕێ و دەرچەیەك بۆ ســــەرکەوتن بدۆزەوه ئەگەر هیچ دەرچەیەکیش نەبێت پێویسته خۆت دروستی بکەیت بەدوای خەونەکانت بگەڕێ بزانه چیت دەوێت ئەوه بکه دڵنیابه لەوەی هەموو ڕێگایەك کەوتن و بەرز و نزمی تێدایه, بەڵام هەموو ئەوانه مانای ئەوه ناگەیەنن کە ناتوانی بگەی بەوەی دەتەوێ بەڵکو بەپێچەوانەوە وادەکات بەهێزبیت بەردەوام و موکوڕ بیت لەســـەر خەون و ئامانجەکانت هەرچی دەبێت با ببێت چی دەوترێت و چی دەکرێت گرینگ نییه

تەنها لە مێشـــکی خۆتدا وا وێنای بکە کە براوەیت و بەهێزەوە بەرەو پێشـــەوە هەنگاو بنێ بێ ئاوڕدانەوە بۆ دواوە بێ ئەوەی هە ست بە شکست بکەیت لە شوێنێکا ئەگەر قورسییەکت هاتبێتە پێش لەبەر ئەوەی چەندە تەنگ و چەڵەمەت چەشـتبێ ئەوەندە بەهێزتر دەبیت, هەموویان دەبن بە وانەیەك بۆت و کەسێکی بە ئەزموونت لێدەردەچێت.

سوپاسگوزاربە لەسەر ئەوەی ئێستا هەتە و هەوڵی بەدەست هێنان و گەیشـتن بە خەونەکانیشـت بدە و ترسـت نەبێت لەوەی کە سـە رکەوتوو دەبیت لە گەشـــتن بە خەونەکانت یان نا چونکە ترس ســـاردت دەکاتەوە لە هەوڵدان وادەکات هەمیشـــە لە دوورەوە سـەیری خەونەکانت بکەیت و کاریان بۆ نەکەیت (سـهام العنزی) ئافرەتێکی شـــاعیر و ڕۆماننوســـی وڵاتی ســـعودیەیە لە کتێبی (بەهێزبە) دەڵێت: (ڕووبەڕووی ترســـەکانت ببەرەوە لێت ڕادە کەن) ئەو دەمەی دەستەوەستان وەستای لەبەردەم هەنگاوەکانت بۆ بـەرەو پێش چوون بێ ئـەوەی ئـاگـاداربی هێواش هێواش بـەرەو دواوە دەچیت بۆیـە ئـەگـەر دەتـەوێت بـەردەوامبیت لـە ژیـان و دڵخۆشـــبی بـەوەی کـە براوە دەبیت واز لـە ترس بێنـە و یـەکـەم هەنگاوی خۆت بنێ چونکە یەکەم هەنگاو وەك خاڵی دەســـتپێك نهێنی ســـەرکەوتنە, متمانەت بەخۆت هەبێت و باوەڕ بەخۆت بێنە کە دەتوانی ئەوەی دەتەوێت ئەنجامی بدەیت هەوڵ و کۆشش لەبیر ناکرێت ئەگەر هەوڵی خۆت نەدا شـــکســـت دێنیت بۆیە تواناکانی خۆت بە کۆڵنەدان تاقی بکەوە گرینگ ئەوە نییە لەکوێی گرینگ ئەوەیە دەتەوێت بەرەو کوێ بچیت.

## بەردەوامبە لە بەرەوپێشچوون!

بەرەو پێشچوونی خۆت بە هیچ شتێکەوە مەبەستەوە مەگەر تەنها بەرەوپێشچوونێکی گرینگتر لەوەی یەکەم هەبێت و وات لێ بکات گرینگی پێ بدەیت ئەوەشیان ئاساییە گرینگ ئەوەیە ناوەستیت, ئە وەشت بیربێت بەرەوپێشچوونەکان هەمیشە لەکارکردندا نین بە ڵکو هەڵمژینی هەوایەکی سازگار و گەڕان و پشوو وەرگرتنی دوای سەرکەوتنە گەورەکان هاندەرێکی زۆرباشە بۆ بەردەوامیدان بە سەرکەوتنەکان.
چاوەڕێی هیچ کەسێك مەبە دەستت بگرێ و بتبات بەرەو ئامانجە



کانت ئەوە خۆتی دەبێت کاری بۆ بکەیت و ڕەنجی بۆ بکێشی, هەر ڕۆژێك کە لێت دەڕوات و بەرهەمێکت تێیدا نەبووە لە بەرەوپێشبردنی لایەنی ڕوحی و هزری و جەستەیی و ماددی و سەرجەمی هەستە تایبەتەکانت یان هەر یەکێکیان لەسەر حیسابی

بەرەوپێشــــچوونی تۆیە و بە تێپەڕبوونی ئەو ڕۆژانە و کەڵە کەبوونیان لەســــەر یەك وادەکات لە کاروانی (ببە بەخۆت)دا دوا بکەویت.
چاوەڕێی هیچ شـــتێك مەکە بۆ ئەوەی بڕیار بدەی بوەســــتی یان بەرەو پێش بچیت مادام ژیان بەردەوامە تۆش بەردەوامبە, لەبیرت بێت ئەوەی خەونتە ودەتەوێت ببێتە راســـتی تەنها هەوڵ و تێکۆشـــانی خۆتە دەتوانێ بیکات بە ڕاســـتی و بیهێنیتە دی, تەنها شتێك کە پێویستە بیزانیت ئەوەیە
چی دەکەیت؟
بەرەو کوێ دەڕۆیت؟
ئامانجت چییە؟
مامۆســتا )ناسـڕی سـوبحانی) کە کورد پەروەرێکی ڕۆژهەڵاتی کوردســتان بوو هاوکات زاناو بیرمەند و ڕەخنەگر و نوێگەرێکی ئایینی ئیســـلام بوو دژی لاســـاییکردنەوە و دووبارەکردنەوەی هە ڵەکانی کەلەپوری ئیســـــلامی بوو وتەیەکی بەناوبانگی هەیە دە فەرموێت: (ئەبێ بزانم چی دەکەم و چی ناکەم! بەمن چی چی دەبێت و چی نابێت) گرینگە لە وێســـــتگەی چاوەڕوانیاندا زۆر نە وەستی و کاتەکانت لەو وێستگەیەدا بەزایە نەدەیت, بەڵێن و گفت و پەیمانی گەورە هەن هیچیان بەقەد ئەوە گەورە نابێت کە لە چاوەڕوانیدا بەجێت نەهێڵن و پەیمانی چاکیشیان پێ سپاردبیت, بە شـــێوازێکی تر گەورەترین چاکە لەگەڵ کەســـێکی خاوەن هیوا و خەون و بڕوا ئەوەیە ئەرك و بەرپرسیارییەتییەکی پێ بسپێریت و بیکەیت بە دیاری بۆی باشـــتر لەوەش بەخشـــینی هاندان و یارمەتیدان و بەخشـــینی بڕوا بەخۆبوونە بە کەســـێکی بێ هیوا لە ژیان و لەگەڵیدا دەستگرتنییەتی تا ئەو شوێنەی جێگا دەستی خۆی لێ قایم دەکات.

## یارمەتیدەر و هەماهەنگ کاربە لەگەڵ دەوروبەرت!

ژیـانی مرۆڤ گرێـدراوی ژیـانکردنێکی مرۆڤـایـەتی ئـایینی نیشـــتیمانی نەتەوەیی کۆمەڵایەتی خێزانییە دەکرێت یەکبەســـتنی پەیوەندی هەر مرۆڤێك لەگەڵ مرۆڤێکی تردا هاوئاهەنگی لەسـەر



ئایدۆلۆژییەکی تایبەتی لەپشـتەوەبێت, نکۆڵی ناکرێت لە ژیانکردن بەبێ مرۆڤایەتی و بوونی مرۆڤ و مامەڵە و ژیانکردن لەگەڵ دونیای مرۆڤایەتی بەوەی کە مەحاڵە مەگەر بۆ کەســـێك ئەمە ڕاستبێت کە نەخۆشبێت.
ئـەو پـەیوەنـدییـە بـەهێز و پتـەوە بـەرژەوەنـدییـە پێکـەوەییـەکـان بەهێزتریان دەکات ئەوەش وادەکات ژیان ئاســـانتر و باشـــتر و خۆشتربێت لەو گۆشەگیرییە, باشترین بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەیە کە

لەکاتی ناخۆشی و قەیران و کارەساتێکی سروشتی یان بڵاوبوونەوەی نەخۆشـــی یانیش خەم و ئازارێکی تایبەتی مرۆڤایەتی پەنا بۆ یەکتری دەهێنێت و بەیەکەوە بەهێزتر و باشتر سەختییەکان تێپەڕ دەبن, بۆیە هەمیشـــە ژیان لە کارکردنی پێکەوەییدا ئاســـانترە و کۆکردنـەوەی بیرۆکـە و یـارمـەتییـە جۆربـەجۆرەکـان داهێنـان و پڕۆژەی بەهێز و گەورەی بەدواوەیە.
وەك ڕوونە ژیان بریتی نییە لە ڕاســـتە شـــەقامێکی بێ کەند و کۆسـپ بەڵکو سـەختی زۆری پێیە و خۆشـی زۆری هەڵگرتووە, دەروونناس (سـیگمۆند فرۆید) پێیوابوو بەهۆی ئازارەوە قورسـە مرۆڤ خۆشبەختی بەدەستبهێنێت, ئەو ئازارەش سێ بەشە:
ئـازاری جەســـتەیی (بـایۆلۆژی): بەهۆی لاوازیی جەســـتە و نەخۆشی و پیری و مردنەوە.
ئازاری سرووشتی: بەهۆی هێزی سروشت و کەمتوانایی مرۆڤ بۆ جڵەوکردنی ڕووداوە سرووشتییەکان.
ئازاری شـــارســـتانی: بەهۆی لاوازیی لە پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ لەگەڵ یەکتریدا و قورسیی ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی.
بۆیە با تەنها لە ســـاتە خۆشـــەکان لای یەکتری نەبین و لە سـەختییەکانی ژیانیشـەوە بە هاوبەشـی تێیبپەڕێنین لە پێناوی کەمکردنەوەی ئاسەوارەکانی, هەرکەسێك پێویستی بە یارمەتیت بوو یارمەتی بدە ئەگەر خۆشـــت نەتتوانی یارمەتی بدەیت هەوڵدە لەڕێی کەســـانێکەوە هەوڵی بۆ بدەیت مەرج نییە لەبەرامبەر هەر چاکەیەك کە دەیکەیت چاکەیەك وەربگریتەوە, ئەگەر چاکەیەکت کردووە لەگەڵ کەسـێك وەك قەرزارێك سـەیری مەکە وای دابنێ ئەرکە لەســەرت کە یارمەتی بگەیەنی بەکەسـێك کە پێویسـتی بە یارمەتی تۆیە لەپێناوی جوانکردنی مرۆڤایەتی بەو شـــێوەیەی کە پێویســتە هەبێت و هێشـتنەوەی جوانییەکانی ژیان کە لەوەوە سـە رچاوە دەگرێت.
ئەگەر تۆ کەسـێکی لەوانەی بەدوای جوانکردنی ناخ و دەروون و هەستەکانتدا ڕادەکەیت و هەوڵی بۆ دەدەیت دەبێت ئەوەش بزانیت

که بەهێزکردنی کەسایەتیت تەنها لە باشترکردنی ناوەوەی خۆت ناشـــێت بێتەدی بەڵکو لەگەڵیدا و هاوتا لەگەڵی پەیوەســـتە بە سیستەمی ئەخلاقیات بڕیاردان و هەوڵدان و ویستێکی خودی کە دەرئەنجامەکەی لە چییەتی و چۆنییەتی هەڵوێســـت و کردارەکانە وە دەردەکەوێت, کەســـی وا هەیە هەموو ژیانی لە ســـواڵکردن بە ســـەردەبات بۆ ئەوەی نەکەوێتە ســـواڵ مەرجیش نییە ســـواڵکردنە کەی تەنها بۆ پارەبێت بەڵکو لەوەیە بە قسەکانی سواڵی مرۆڤایەتی و یەکسانی و دادپەروەری و چاکسازی...هتد بکات و لە ڕاستیشدا خۆی بە کردار و هەڵوێســـتەکانی ئەوە دەســـەلمێنێت کە هیچی لەباردا نەبووە.

## به بەرنامە و پلان و ستڕاتیژی کاربکە!

هەر ئامانجێك, هەر پێشکەوتنێك و بەردەوام بوونێك, پێویستی بە بەرنامەڕێژی هەیە هیچ شتێك لەخۆیەوە ڕێك ناخرێت کە دەوترێت (ئاشی نەزان خوا دەیگێڕێت) ڕۆژێك دێت ئەو ئاشە سەراونگوم ببێت




خودای گەورە ئەوکاتە یارمەتیدەرە کە خۆت یارمەتی خۆت بدەیت کە هەست بە بەرپرسیارییەتی نەکەیت شایانی هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتیش نابیت, یارمەتی خۆت بدە هەمووکات خودای گەورەت لەگەڵ دەبێت.

ژیانت پێویستی بە ستڕاتیژی دووروودرێژ هەیە بە دانانی پلانی مەودا جیاواز و بە بەرنامەش کاری بۆ بکەیت, هەمیشە لە ژیانت ستڕاتیژی دووروودرێژ دابڕێژە بزانی کە چیدەکەیت بەرەو کوێ دەچیت و نوێسازی بکە بەپێی گۆڕانی بارودۆخ و ئاڵەنگارییەکانی دێنە پێشت, ڕێگاو هەوڵەکانت با دیاربن کە بەرەو چ ئاڕاستەیەکە ئەو مرۆڤەی ئامانجی نییە لەژیانی و تەقەڵا بۆ هیچ شتێك نادات بێبەشە لە چێژی دەستکەوتەکان! (زیگ زیگلار) یەکێك لە بەناوبانگترین نوسەر و قسەکەری هاندەری ئەمریکا و جیهانە دەڵێت: (کێشەکە نەبوونی ئاڕاستەکردنێکی ڕێکوپێکە نەك نەبوونی کات, چونکە ئێمە هەموومان بیست و چوار کاتژمێرمان هەیە لە ڕۆژێکدا) گرینگی ڕێکخستنی کات ڕەهەندێکی گرینگە و نابێت پشتگوێ بخرێت بزانە کاتەکانت بەچی بەڕێ دەکەیت و بە پلان بەڕێوەیان

ببە با پلانت بۆ هەموو شـــتێك هەبێت, بەڕێ كردنی ڕۆژەكانی هیچ كـەس بـە تـەواوی لـەكـەســـی تر نـاچێت بۆیـە داهێنـان لـە ڕێكخســـتنی كاتەكانتدا بكە بزانە چۆن كاتەكانت دابەش دەكەیت سەرەتا ستڕاتیژیت پێویستە بۆ ڕێكخستنی كاتەكانت دەبێ بزانیت خـەریكی چیـت و ئـامـانجـت چییـە و بـەرەو كوێ دەچیـت, لـە مەودایەكی مامناوەندا پێویســـتت بە پلان دەبێت پلانی هەفتەی دا هاتووت چی دەبێت؟ لە مانگی دا هاتوو دەتەوێت چی بكەیت؟ ئایا ئامادەییت تێدایە بەرەو مانگەكانی تر هەنگاو بنێیت؟

بەرنامەڕێژی لە بچوكترین خاڵدا كە لەڕاســـتیدا بە بنچینە و ژێرخان دادەندرێت بۆ بەرەو پێشچونت, وەك سـەركەوتن بەسـەر پلیكانەكان وایە وەك دانانی ژێرخانی خانوو وایە لە خاڵی بچوكە وە دەســـت پێدەكات, دڵنیابەرەوە لە بەرنامەدانان بۆ ڕۆژەكانت, كاتژمێرەكان دابەش بكە كات بەفیڕۆ مەدە كاتە بەتاڵەكانت بە شـتێك پڕ بكەوە سوودی هەبێت نەوەك شـتێكی لاوەكی بۆ نموونە كاری ئێســـتات دوامەخە بۆ دواتر ئەگەر ئێســـتا كاتت هەیە با بەبەتاڵی تێپەڕ نەبێت ڕەنگە دواتر كارێكی ترت بۆ دروست ببێت نەتوانی بە تەندروســـتی ڕێكیان بخەیت, با تەركیزت ورد ببێتەوە لە بەرنامەكانی ڕۆژانەت كار لەسەر ئەمڕۆ بكە و بزانە سبەی بە تەمای چیت زۆرترین و درێژترین چڕبوونەوەكانت لەسەر مەودا كورتەكان بێت لەجیاتی ئەوەی بیر لە چەند ســـاڵی داهاتوو بكەیتە وە بیر لە هەفتەكانی دا هاتووت بكەوە ئەوە دوورت دەخاتەوە لە دوودڵی و هەســـتكردن بە نیگەرانیت ســـەبارەت بەوەی لە ســـاڵی داهاتوو دەگەیت بەوەی دەتەوێ یان نا!؟

تەنها سووربە لەسـەر ئەو هیواو ئاواتەی كە دەتەوێت پێی بگەیت و ئەمڕۆ كاری بۆ بكە.

## ویست بۆ ئامانجەکانت زیاد بکە!



هەر مرۆڤێك ئەگەر بیرۆکەیەکی هەبوو بەڵام ویستی جێبەجێکردنی نەبوو ئەوا بیرۆکەکەی نایێتەدی! لەبەر ئەوە نییە کە بیرۆکەکەی نایەتەدی بۆیە نەبێتە ڕاستییەکی سەلمێنراو بەڵکو لەبەر ئەوەیە ویستی هێنانەدی بۆ دروست نەکردووە, واتا هەر هەموو ئامانجێك لە ژیانتدا بەستراوە بە ویستەوە ئەگەر بتەوێ دێتەدی ئەگەر ویستت لێی نەبوو خۆی نایەتە بەردەمت.
ئەو کاتەی ئامانجتە فێری زمانێکی نوێ ببیت لەبەر ئەوە نییە کە فێرنابیت بۆیە فێری زمانێکی نوێ نابیت بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە نەتویستووە فێری ببیت ڕوونە کە لە ئەزەلەوە کەس هەموو شتێك نازانێت هەر شتێکیش لە توانای مرۆڤدا نەبێت و مرۆڤ عەقڵی بەسەردا نەشکێت ئەوا هیچ هێزێك نییە بتوانێت بیشکێنێت هەروەکوو خودای گەورە خۆی لە قوڕئانی پیرۆدا لە سوڕەتی )البقرة)

دەفەرمویت: (إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (٢٠) واتا: بێگومان خودا بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارە.
ویست خۆی لەخۆیدا چەند هۆکارێکی هەیە بۆ ئەوەی تەواوبێت و هەر لە چوارچێوەی ویستێکی بێ ڕۆحدا نەمێنێتەوە ئەو ڕۆحەی ویستیش هەمان ئەو ئامرازانەیە کە پێویستن بۆ هێنانەدی ئامانجەکەت واتا تۆ ئەو کاتە دەتوانیت ئامانجەکەت بهێنیتەدی کە لەپاڵ هەبوونی ویستت بۆ هێنانەدی ئامانجەکەت کار بەو ئامرازانە بکەیت کە پێویستن و بڕاردەی دروستن بۆ هێنانەدی ئامانجەکەت, ئەگەر هەتا هەتایی ویستت هەبێت بۆ ئەوەی کارێك بکەیت ئەگەر هەوڵت بۆی نەدا سوودێك نابینی لە هەبوونی ویستەکە واتا سیانەی بەیەکبەستراون لەپاڵ ئامانجدا ویست بوونی هەیە لەپاڵ ویستا کارکردن چونکە پێوەری ڕاستەقینەی هەموو ویستێك لە کردارەوەیە بەبێ سەلماندنی ویستەکە لە کاتی بوونی دەرفەتی ڕاستەقینەدا مانایەك نامێنێتەوە بۆ ویستەکەت, پێوەرێکی ڕاستەقینە هەیە بۆ سەلماندنی ئەو ویستەی کە هەتە ئەویش کردارە چونکە خودی کردار پێوەری ڕاستەقینەیە بۆ هەڵسەنگاندنی هەر مرۆڤێك نەوەك گوفتار ئەوەی بمانەوێت بێتەدی تەنها بەقسەکردن نابێت, چونکە بەهای کرداری باش بەتەنها تەواو نابێت بە قسەی باش, لەپاڵیدا سەلماندنی بە شێوە کردارییە کەی دەتگەیەنێت بە ئامانج, گرینگی بەوە مەدە کە کێ دەیبینێت یان گرینگە بۆی چونکە ئامانج لە سەلماندنی بوون بە خۆت و بە وەی کە هەیت پیشاندان نییە بەڵکو ئاسوودەبوونی خۆتە.
ئەو کاتەی ویستت دەبێت پێویستە بیخەیتەگەڕ چونکە (ئەگەر ئەمڕۆ وەك دوێنێ بێت بەیانیش وەك ئەمڕۆ دەبێت) کەوایە کەی ویستت زیاد کرد بۆ ئامانجەکەت ئەوکات دەستپێبکە ئەگەرنا دواده کەویت لەوانەیە دەرفەتەکە لەدەست بدەیت, ئەگەر بڕیار وایە داهاتوو جوان بکەیت ئێستا دەست پێبکە لەبەر ئەوەی ئەگەر دوێنێت جوان کردبا ئەمڕۆت جوانتر دەبوو خاڵی دەستپێك خاڵی گۆڕانکارییە ئەو شوێنەیە کە شەمەندەفەری ئامانجەکەت تێیدا

دەخەیتەگەڕ و تاوی ئەسـپەکەتی تێدا دەدەیت بەبێ دەسـتپێك هیچ ئەنجامێکی باش نایەتە کایەوە, (ژۆزێ ساراماگۆ) چیرۆکنووس و ڕۆژنامەنووس و شـانۆنووسـی پورتوگالی و خاوەنی خەڵاتی (نۆبڵ) لە ئەدەبدا لە کتێبی ( هاوشـێوەکانی پیاو ێك)دا دەڵێت: (ئەوەی ئەمڕۆ پێمان وایە ڕاسـتییە، دوێنێ وەک خەیاڵ سـەیری دەکرا) بۆیە جیاوازییەکە تەنها ویسـتی گۆڕانکارییە و هێنانەدی ئەو خەیاڵانەیە بە کارکردن لەپێناویاندا.

ترس لە ڕزگاری زۆر خراپترە لە خودی ژێردەستەیی, بەڵام ئە وکاتەی کە گۆڕانکاری لەخۆت لە کارەکەت لە هەڵسوکەوت و لە بەرنامەی ژیان و پیشەکەت یان بیرو باوەڕ و بیرکردنەوەکانت یان هەر بڕیارێکی تری تایبەت بەژیانت کە پێویستن بگۆڕدرێن و دڵنیایت لێیان دوای مەخە چونکە ڕەنگە کات دەرفەت نەدا ئەوە بکەیت و ترست نەبێت لێی گرینگ ئەوەیە تۆ ژێردەستە و کۆتی بیرکردنەوەکانت نەبیت و ئازادی و رزگاربوون بهێنییە فەرهەنگی ژیانتەوە.




زۆرجار گوێمان لەو قسانە بووە یانیش خوێندوومانەتەوە ئەگەر بەڕێکەوتیش بووبێت کە دەڵێن: (پێویستە خۆت بگۆڕیت, تۆ پێویستت بەوەیە گۆڕانکاری لەخۆتدا بکەیت, ئەو بڕیارەی داوتە بڕیارە دروستەکە نییە, ئەو ژیانەی ئێستا تێیدایت شایستەی تۆ نییە....هتد) ئەم قسانە و زۆر قسەی تریش کە زۆرجار لە چوارچێوەی بابەتی (گەشەپێدانی مرۆیی) و لەسەر ئەو چەمکە هەژمار دەکرێن ڕەنگە لە هیچ و خۆڕایی دوودڵمان بکەن لەسەر هەر بابەتێکی پەیوەستەوە کە لەو کاتەدا بڕیارت لێی داوە وە ئەمە بۆ زۆر لەوانەی کە بەشێوەیەك لە شێوەکان پاشخانێکی هزری و مەعریفییان نییە لەبری ئەوەی ببێت بە ڕۆشنکەرەوەیەك بۆ

ژیانیان توشی سەرلێشێواوی و ڕاڕاییان دەکات و تەنانەت بەرەو یاخی بوون و گۆشەگیریش دەچن, ئەو شێوازە لە نوسین و قسە فڕێدانە کە نەك هیچ سوودێکیان نییە بەڵکو زۆرجار بۆ کەسێك کە لە بارودۆخێکی ناجێگیری دەروونی دایە یان لە حاڵەتێکی دوودڵی و خەمۆکی دایە هەرچەندیش پاشخانی ڕۆشنبیری و بابەتەکانی هاوچەشنی هەبێت ڕەنگە بەزوویی کاری لێ بکەن و بەرەو تراویلکە و ساوێرێکی نادیاری ببەن.
دەبێت سەرەتا لەخۆمان بپرسین ئاخۆ ڕزگاری لەچی؟ لەپێناوی چی بگۆڕێین؟ ئاخۆ ئێستا چۆنین کەوا گۆڕانکاری لەخۆماندا بکەین, خێرا لەژێر کاریگەری ئەو قسانەدا تووشی گومان مەبە تەنها بیخوێنەوە پاشان بیری لێ بکەوە, مرۆڤی زیرەك و ژیر هەرگیز ناچێتە ژێرباری هیچ قسەیەکەوە و بڕیارەکانی ژیانی ناداتە دەستی هیچ کەس چونکە هیچ کەس وەك خۆی لەخۆی تێناگات و نازانن کە چی دەوێت, نووسەر و ڕۆماننوسی بەڕازیلی (پاولۆ کۆیلۆ دێ سووزا) دەڵێت: ( لەهەر کەسێکەوە دەست پێبکەیت بیرۆکەیەکی پێیە بۆ ئەوەی تۆ چۆن بژیت, بەڵام هیچیان بیرۆکەیان پێ نییە خۆیان چۆن بژین لە ژیاندا) ڕاستییە کە ئەوەیە ئەگەر بتەوێ پرسیار لەخەڵکی بکەیت کە چۆن بژیت هەرکەسێك و دەیان بیرۆکەی جیاوازت پێ دەدات کە ڕەنگە هیچ یەك لەو بیرۆکانەش لەژیانیدا بوونیان نەبێت, بۆیە خۆت بیرۆکەکانت دابڕێژە و ژیانت پەیوەست مەکە بەهیچ کەسێکی ترەوە جگە لەخۆت.
جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەو کەسەی کە خۆی دەگۆڕێت بە هەڵبژاردنی خۆی و لەکاتی پێویستدا, و ئەو کەسەشی کە خەڵکی دەیگۆڕێت ئەوەی یەکەمیان لە ئەنجامی ئەو گۆڕانەوە ڕزگار دەبێت لەهەموو ئەو خووە بەد و باوانەی کە کەوتبووە ژێر کاریگەریانەوە, بەڵام ئەوەی دووەم بەرەو تراویلکەیەکی دوورمەودا دەڕوات کە ڕەنگە ونی بکات, خۆی بابەتی گۆڕانکاری لە ئەنجامی هۆشیارییەوە سەر هەڵدادەت, چونکە

گۆڕان ئەنجامی لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن و بیرکردنەوەیە, بەڵام بەبێ بوونی هیچ هەڵبژاردەیەك بۆ ئەو دۆخەی ئێستات گۆڕان نایەتە کایەوە بەڵکو تەنها پاشەکشەیەکە! چونکە گۆڕان لەپێناوی دۆخێکی باشترە لەوەی ئێستا و بەرەوپێشچوونە نەوەك پاشەکشە, وە لەپێناوی دووبارە نەبوونەوەی ڕابردوو گۆڕان و دواجار ڕزگاربوون لەو دۆخە خراپە بەرەو دۆخێکی باشتر ئەویش بە بوونی هەڵبژاردەیەکی گونجاو ئەوکاتەی هەڵبژاردەی گونجاو بوونی دەبێت گۆڕانکاری دەبێت بە ئەرك.

## خودی شکست لەبێ ئامانجیەوەیە!

ئەوکاتەی کە مرۆڤ خۆی بە ئامانجێکی دیاری کراوەوە دەبەستێتەوە لێیەوە ویستت و بەرنامە و پلانی لێوە بەرهەم دێنێت و پاشان هەوڵی هێنانەدی ئەو ئامانجە دەدات و تواناکانی خۆی دەخاتە بەر تاقیکردنەوە, بەڵام ئەو کاتەی کە کەسێکی بێ ئامانج بوونی هەیە لەو ساتەی کە تێیدایە لە شکستدا دەژیت واتا جیاوازی نێوان کەسی ئامانجدار و بێ ئامانج ئەوەیە کە کەسی ئامانجدار لەپێناوی سەرکەوتن و ئامانجێك کە دەیەوێت دەژیت و هەوڵی بۆ



دەدات ئیتر ئەو ئامانجە هەر چیەکبێت, دونیایی بێت یان بابەتی ڕۆحی و ئایینی ئەوەیان بابەتێکی کەسییە و بەپێی کەسەکان دەگۆڕێت گرینگ ئەوەیە لەپێناویدا تێدەکۆشێت, بەڵام کەسی بێ ئامانج لەناو شکستدا دەژیت بەبێ ئەوەی هەوڵی دەرچوون لەو گێژاوە بدات.

لەبەر ئەوەی نەبوونی ئامانج خودی شکستی لێوە بەرهەم دێت بۆیە ئامانجێك دابڕێژە و بەدوای ئەوەدا بگەڕێ کە دەتەوێت, لە بەهرەکانتەوە حەز و ئارەزووەکانیشت بدۆزەوە چونکە ئەوکاتەی

بەهرەیەکت هەیە و لەپاڵیدا حەز بەو بەهرەیەت دەکەیت داهێنان دێنیە کایەوە, لەپێناوی ئەوەی کە ببیت بەخۆت و پەیکەرێکی مشەخۆری بێ بەر هەمت لێوە نێتە کایەوە بەدواداچوون بکە بۆ هە رشتێك کە خۆشتدەوێ و پەرەی پێ بدە کاتی بۆ تەرخان بکە!
زانیاری بەدەست بێنە لەسەر هەر بابەتێك کە بتەوێ دەتوانیت لە سەردەمی کتێب و تەکنەلۆژیا و زانستدا زۆر شت بەردەست بخەیت, تۆ پێویستتت بەوەیە کە پاڵنەرێکی دەروونی بۆخۆت دروست بکەیت لەپێناوی ئەوەی بەردەوامبیت بە گەرموگوڕیەوە و هانی خۆت بدەیت سەیری ئەو دا هاتووە بکەیت کە لەدوای گەشتن بە ئامانجەکەتەوە دێتە بوون.
چێژێکی تایبەت بوونی هەیە ئەوکاتەی دەژیت لەپێناوی ئامانجێك, ئەوکاتانەی کە مرۆڤ بێ ئامانج دەژیت تووشی سەرگەردانی و ون بوون دەبێت و خۆی لێ ون دەبێت ئەوە وادەکات هەمیشە وەك پاشکۆ و بێچارە ببینرێیت دڵنیابە لەوەی تۆ شایەنی بەزەیی پێدا هاتنەوە نیت تەنها پێویستتت بە یارمەتییە ڕەنگە بەتەنها یار مەتیدانی خۆت بۆخۆت بەسبێت بۆ ئەوەی بتوانیت خۆت بدۆزیتەوە چونکە جەنگی ئێستا جەنگی ئەلیکترۆنی و خوێندن و خوێندنەوەیە جەنگی هۆشیاری و بیرکردنەوەیە ئەوەی خۆت بۆخۆتی دەکەیت زۆر لەوە ئاسانترە تا ئەوەی لەکەسێکیترەوە وەدەستی دێنی, بەو شێوەیە بیر بکەرەوە کە جیهان شوێنی تۆشی تێدا دەبێتەوە تەنها پێویستتت بەوەیە هۆشیاربیت و پەی بەو شتانە ببەیت کە پێویستە بیانزانیت لەپێناوی ئامانجێك تێبکۆشە و لەهە وڵەکانت بەردەوامبە و گوێ بە قسەی پاشکۆیانەی هیچ کەسێك مەدە چونکە ترسی سەرکەوتنەکانتە وادەکات ساردت بکەنەوە, ئەو کاتەی گوێبیستی قسەی پاشکۆیانە بویت بزانە کە لەسەرکەوتندایت یانیش لەنزیکتەوەیە.

## نەبووەکان مەکە بە بوو!

نـەبووەکـان مـەکـە بـە بوو لـەبـەر ئـەوەی ئـەو کۆت و زنجیرەی لەخۆتی دەبەستییەوە لەبەر ئەوەی هەنگاو نەنێی لە ترسی ئەوەی توشـــی زیان نەبیت تەنها وەهم و تڕاویلکەیەکە خۆت بۆخۆتی دروســت دەکەیت, لە ســەرەتای هەر کارێکدا بوویت هەرگیز بە شـێوەیەك بیر لە شـتە نەرێنی و خراپەکان مەکە کە کاریگەربێت



لەســـەر هەوڵ و ماندوو بوونەکانت, خەونەکانت لەناو ببات یان دوورت خاتەوە لەو کەسـێتییەی کەخۆت دەتەوێت ببیت پێی, ئەوە وەك ئەو کەسـە وایە کە پرچێکی کامڵ و بێ کێشـەی هەیە پێش ئە وەی قژی بڕوتێتـەوە خۆی کـەچـەڵی دەکـات بـەبیـانوی ئـەوەی پێشـبینی و لێکدانەوەکانی ئەو بۆ داهاتوو ئەوەیە قژی لە داهاتوودا دەڕووتێتەوە, هەرگیز پێش ڕووداوەکان مەکەون هەرچەند ئەو کارە کارێکی نالۆژیکی بێت بەڵام هەمان شـێوەیان هەیە کاتێك لە تاقیکردنەوەدایت و ورەی خۆت بەوە ڕوخاندووە کە دەرناچیت

پێش ئەوەی پێشبینییە خراپەکان بکەیت کاری لەسەر بکە کۆشش بکە بیر لە خراپترین حاڵەت مەکەوە کە هێشـــتان نەبووە, بەڵام ڕێگا لۆژیکی و عەقڵانییەکە ئەوەیە ئامانجێك دیاری بکەیت لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ بکەیت پلانەکانت دابڕێژیت و کاری لەسەر بکەیت, مامۆستا ( ناسڕی سوبحانی) کە کوردپەروەرێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو هاوکات زاناو بیرمەند و ڕەخنەگر و نوێگەرێکی ئایینی ئیســـلام بوو دژی لاســـاییکردنەوە و دووبارە کردنەوەی هەڵەکانی کەلەپوری ئیسلامی بوو وتەیەکی بەناوبانگی هەیە دەفەرموێت: (ئەبێ بزانم چی دەکەم و چی ناکەم, بەمن چی چی دەبێت و چی نابێت) ئەوەی گرینگە ئەو ساتەیە کە تۆی تیادا دەژیت لەو ســـاتە بژی و بیر لەو ســـاتە بکەوە کە تێیدایت خۆت ســـەرقاڵ مەکە بە داهاتووێکی خراپ کە لە هزری خۆتدا وێنات کردووە هاوکات لەگەڵ ئەو بیرکردنەوە خراپانەی دەیانکەیت و پێشـــبینیان دەکەیت چەندین ڕووداوگەلی باش چاوەڕێتن پێش ئە وەی بەو شـێوە خراپە بیر لە داهاتوو بکەیتەوە بیر لە لایەنە باشـە کەشی بکەوە.

هەر داهاتووێك باشـتر بڵێین هەر شـتێك ڕووداوێك کە هێشـتان ڕووی نەدابێت ناکرێت کورت بکرێتەوە لە یەك ئەگەر بە باشـەبێت یان بە خراپە مادام هێشـتان نەبووە دوو ئەگەری هەیە یان ئەوەتا بە باشە تەواو دەبێت و لەبەرژەوەندی تۆ دەبێت, یان ئە وەتا خراپەیە وە دژی بەرژەوەندی تۆیە, هەمیشـــە خاڵی یەکەم لە هزری خۆتدا وێنا بکە کە بە باشـــە تەواو دەبێت بە بیرکردنەوە و خۆ ئامادەکردن بۆ ئەو بارودۆخە ســـەختەش کە ڕەنگە ڕوویدات بەبێ ئەوەی کاریگەربێت لەسـەر کارەکانت یان دەروونت نائارام بکات و ساردت بکاتەوە کە دەستبەرداری ئەو خەونەت بکات کە کۆشـــشـــی بۆ دەکەیت (ژۆزێ ســـاراماگۆ) چیرۆکنووس و ڕۆژنامەنووس و شـانۆنووسێکی پورتوگالی کە خەڵاتی نۆبڵی لە ئەدەبدا بەدەستهێناوە لە پەیڤێکی پوختدا دەڵێت: (لە کوێری خراپتر ئەوەیە یەك لای شتەکان ببینی).

بەرەو پێشــچوونی خۆت بە هیچ شــتێکەوە مەبەســتەوە چاوەڕێی هیچ شــتێك مەکە بۆ ئەوەی بڕیار بدەی بوەســتی یان بەرەو پێش بچیت مادام ژیان بەردەوامە تۆش بەردەوامبە تەنها شـــتێك کە پێویستە بیزانیت ئەوەیە چی دەکەیت؟
بەرەو کوێ دەڕۆیت؟
ئامانجت چییە؟
پلان و بەرنامەڕێژییە گونجاوەکانت چین؟
پێویستە ئەو ڕاستییەش لەبیر نەکەیت گەیشتن بە هەر سەرکەوتن و ئامانجێك بەبێ ســەختی و نارەحەتی نابێت و پێویســتت بەوەیە قوربانی بۆ بدەیت هیچ شتێك بەدەست نایێت بەبێ ئەوەی قوربانی بۆ بدەیت بەپێی ئەو ئامانجەی کە هەتە, ئەگەر حەز لە شـــتێك دە کەیت پێویســـتە کاتی بۆ تەرخان بکەیت و ماندوو بیت تاوەکوو شــارەزایی پەیدا بکەیت ئەوســا فێریدەبیت! بتەوێ خۆشــەویســتی خەڵکی بەدەست بێنیت پێویستە لە سەرەتادا خۆشەویستی ببەخشیتە وە, بتەوێت پارە بەدەســـت بێنیت و کارێکی ســـەربەخۆت هەبێت لەڕێیەوە دەوڵەمەند بیت لەبەرامبەردا پێویستە بڕە پارەی پێویست خەرج بکەیت, ئەگەر دەتەوێت هیچ سەختییەك نەبینیت لە ئێستاوە واز لەو خەونە بێنە کە هەوڵی بۆ دەدەیت.
بەتەواوی لەمێشـــکی خۆتدا ئەوە یەکلا بکەوە کە ئاســـاییە و دە کرێت تووشــی ســەختی و ناخۆشــی ببیت لەو کاتانەی هەوڵی بەدە ســت هێنانی شــتێك دەدەیت و لەوانەشــە قوربانی بۆ بدەیت, بەڵام هەموو ئەوانە مانای ئەوە ناگەیەنن کە ناتوانیت ســـەرکەوتووبیت بەڵکو وەك پەیژەیەك وان پێویســـتە بەســـەریاندا ســـەرکەویت تا بگەیت بە ئامانجەکەت (تۆماس ئیلیوت) نوســـەر و شـــاعیری ئەمریکی و وەرگری خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی ســـاڵی (١٩٤٨) لە پەیڤێکی ڕەنگیندا دەڵێت: (دەریایەکی ئارام، کەشـــتیوانێکی باش دروســـت ناکات) بۆیە خەریکی لێخوڕینی کەشـــتی ئامانجەکانت بەو ئاســـتەنگەکان تێبپەڕێنە بەهێزەوە دەگەیت بە ئامانجەکەت چونکە لەوە خراپتر نییە هەموو شـــتێکت بۆ ئامادەکرابێت و بنە

ڕەتێکی لاوازت هەبێت نەتوانیت بەباشـــی بەڕێوەبەرایەتی کارە کەت بکەیت بەهێزی پێویســـتی بە پەروەردەیەکی دووروودرێژ هەیە بۆیە خۆت پەروەردە بکە.

**یەك تۆ هەیە دەتوانیت ببیت بەخۆت!**

هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی لە هەر دۆخ و شوێنێك و قۆناغێکی ژیانت باشترین دەستپێکە بۆ ئەوەی هەست بە بوونی خۆت بکەیت, مرۆڤ تەنها لەو ساتەدا کە هەست بەخۆی و هەست بە بوونی خۆی دەکات ناتوانێت ببێت بەخۆی و گەیشتن بەو هەستە پێویستی بە کۆمەڵە کارێك هەیە کە دەبێت ئەنجام بدرێن.




ئەو کاتە تۆ دەبیت بەخۆت کە لەژیانتدا ڕێچکەیەکی دیاریکراوت بۆخۆت هەڵبژارد و تێیدا پشو درێژ بویت و خۆتت کۆنترۆڵکرد و سوودت بەخۆت و سوودیشت بە دەوروبەرەکەت گەیاند, ئەوکاتەی سەرت خستە سەر سەرینەکەت و بە ئاسودەیی خەوت لێکەوت و ویژدانت ئازاری نەدایت و ئەو کاتەی خودا و دایك و باوك و کەسانی چواردەورت و مامۆستا و هاوڕێکانت لێت ڕازی بوون ئەو کاتەی بە قسەکانت هەستی کەست بریندار نەکردبێت ئەو کاتەی بەبێ پسانەوە هەوڵی خۆت بۆ ئامانجەکانت دابێت و ئەو کاتەی بەهێزەوە ڕاوەستایت بەرامبەر ئەو کەسانەی کە ئامانجیان ئەوە بووە بێ هیوایی لەناخت بچەسپێنیت و ئەوەت پێیان پیشاندا کە دەتوانیت بگەیت بە وەی دەتویست تۆ دەبیت بەخۆت! چونکە یەك تۆ هەیە و دەبیت بەو کەسەی کە بڕوات پێی هەیە هەرگیز خۆت ون نەکەیت لەنێو ئەو هەموو کەسە دووبارەیەی کە هەن چونکە ئەگەر وانەکەیت ڕۆژێك دێت تۆش دەبیت بە کەسێك لەو کەسە دووبارانە و لەبری

ئەوەی کەسانی تر حەز بکەن وەك تۆبن هیوای ئەوە دەخوازن وەك تۆیان لێدەرنەچێت و دەبیت بە نموونەیەکی خراپ.
ئەگەر لەنێو کۆمەڵە کەسێکی دووبارەدایت و هەمووان لەوانەن کە هەست بە بوونی خۆیان ناکەن مەحاڵ نییە کە ببیت بەکەسێکی جیا لەوان و بڕیاری ئەوە بدەیت کە خۆت بسەلمێنیت و پیشانی ئەوانی بدەیت کە کێیە ئەو کەسەی بووە بەخۆی, با هەنگاوی یەکەمت ئەوەبێت ببیت بەخۆت ئینجا لێژببیتەوە بەرە و هەنگاونان بەرەو ئەو ئامانجانەی کە هەتن و بڕیاری یەکلاکەرەوە بدەیت و کەسایەتییەکی دروست و سەرکەوتووت لێ دەربچێت, ئەگەر نەتتوانی ئەو ڕێگایەش بدۆزیتەوە و دەرچەیەکت نەبوو لێوەی بڕۆی چیتر بەدوایدا مەگەڕێ و کات بەفیڕۆ مەدە باشتر لە هەموو ئەوانە ئەوەیە خۆت ڕێگایەك دروست بکەیت و هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێشەوە بچیت.
ئەوە بە گرینگ مەزانە کە خەڵکی چی دەڵێن و چی دەکەن یانیش چۆن باسی تۆ دەکەن چونکە ئەوان کە ناتوانن سوودێکت پێ بگەیەنن دڵنیابە لەوەی قسەشت لەسەر دەکەن و بگرە ڕەخنە لە هەنگاوەکانت دەگرن, بەڵام با هیچ یەك لەوانە ساردت نەکەنەوە و بە باوەڕ بەخۆبوون و هیواو گەرم و گوڕی و پلان و کوێرەوەری دوور مەودا و هەنگاوی یەك لە دوای یەك کارەکانت بە ڕێوەبچن, دڵنیابە لەوەی دەگەیت بە هەموو ئەوانەی کە دەتەوێن و ئەوکات هەست بەخۆت و ئەو بەهێزییەت دەکەیت و دڵنیا دەبیتەوە لەوەی هەموو ئەوانە خۆت کردووتە و ڕەنجت پێیەوە کێشاوە بۆیە ببە بەخۆت مەبە بەهیچ کەسێکی تر.

## متمانەی خودا لەدەست مەدە!

بۆ هەر یەکێکمان کە هاتوینەتە سەر زەمین خۆی لە خۆیدا پێدانی متمانەیەکە کە خودای گەورە بە ئێمەی بەخشـــیوە, لەنێو ملیۆنان تۆوی باوانمانەوە زاڵ بوین و یەکەم خاڵی ســـەرکەوتنمان تۆمار کردووە بە گەیشـــتن بە منداڵدانی دایکمان ئەمە بۆ هەر یەکێکمان ڕاستە, یەکەمین گرینگترین سـەرکەوتنی ئێمە لەژیان ئەو خاڵەیە ئەوەش بێ گومان بە یارمەتی خودای گەورە بووە و بە ســـوتفە ڕووی نەداوە بۆیە ئێســـتاش کە لە ژیاندایین دەبێت ئەوە بزانین هەموو دەســـتکەوتێکمان بەیارمەتی خودای گەورە بووە ئەگەر تەمەنێکی پێ نەبەخشـینایە نەمان دەتوانی بگەین بەو دەسـتکەوتە ئەگەر چەند سـاتێك بەر لەوکاتە ژیانی لێ وەربگرتینایەتەوە ئەو هەلەمان نەدەبوو بە دەسـتکەوتەکان بگەین, هەموو ئەوانە بریتین لە متمانەی خودای گەورە بە ئێمە بۆ ئەوە دروست نەبوین متمانە لەدەســت بدەین و کۆڵ بدەین نا بەردەوامبە لە هەنگاوەکانت ســە رکەوتنەکان چاوەڕێتن بەڵام ڕەنگە تەنها کاتیان نەهاتبێت.
بە هەموو توانای خۆتەوە کاربکە و کەمتەرخەمی مەکە گوێ بە قســەی هیچ کەس مەدە بڕوات بەوەبێ کە توانات هەیە بیانکەیت چیتر واز لەوە بێنە کە بەشان و باڵی خۆتدا هەڵبدەیت دەتوانم ئەوە



بکەم و دەتوانم ئاوابم ئەوەی دەیزانی بیگەیەنە ئەوەی پێت دەکرێ

بە ئەمانەتەوە بیکە گوێ بە قسەی کەس مەدە و قسەی کەس با ساردت نەکاتەوە تۆ تەنها دەتەوێ متمانەی خودا لەدەست نەدەیت, ئەوکاتەی بە تێکۆشانت بۆ هەر هەنگاوێك دەڕۆیت و سوپاسی خودا دەکەیت لەسەر ئەوەی پێت دەبەخشێت لەهەر بەرەو پێش چونێك و لەهەر شکستێك تەنها سوپاسی خودا دەکەیت بەوەش خودای گەورە لەخۆت ڕازی دەکەیت و متمانەی خودا بەدەست دێنیت.

مرۆڤ ئەوکاتەی خودای لەخۆی ڕازی کرد و متمانەت خودای بەدەست هێنا خەڵکیش باوەڕی پێدەکەن و متمانەی پێ دەکەن ئە وکات پێویست بەوە ناکات خەم لەوە بخۆیت خەڵکی لەخۆت ڕازی بکەیت خۆی کارە ڕاستەکەت ئەنجام داوە بەوەی خودات لەخۆت ڕازی کردووە هەرکات کەسانێکی دەم بە پرتەوبۆڵەش هەبوون بزانە ئەوان گرینگ نین بۆتۆ چونکە لەسەر ڕێگا ڕاستە کەیت ئەوەی پێویستە گلەیی لێ بکرێت و خۆی بە شەرمەزار بزانێت ئەوانن کە دەبێت پێداچونەوە بەخۆیاندا بکەن!.

قسەکانت هیچ ناگۆڕن بەوەی بیانوو بهێنیتەوە بەوەی خەڵکی بەختیان هەیە و تۆ نیتە لە کاتێك ئەوان خەریکی تێکۆشان و هەوڵدانن تۆش تەماشاکەرێکی حەسرەتکێشی ئەو بیانووە وەك دارێکی بێ بەر وایە هیچی لێ شین نابێت دادپەروەری خودای گەورە زۆر لە بیانوەکانت گەورەترن لەهەر شتێکەوە دەست پێ بکە کە لەبەردەستتە, ڕێگا ڕاستەکە ئەوەیە لەخۆمانەوە دەست پێ بکەین هەنگاوەکانمان رووی قسە و گلەییمان هەمووی بۆخۆمان بێت وەك ئەوەی (خیام)ی شاعیر دەڵێت: (چانابێ جیهان بە ئێمە, با دڵ چابێ) تۆ نابێت ببیت بەکەس تەنها بیر لەوە بکەرەوە کە دەبێت سروشتی خۆتبیت کەوایە واز لەوە بێنە خەڵکی چۆنن چی دەکەن و بەو سەرکۆنەیەت هیچ لە بارودۆخەکە ناگۆڕیت تەنها خۆت چاکساز بکە بەوەی متمانەی خودا لەدەست نەدەیت.

## گرینگیدان بەخۆت خوودپەرستی نییە!

گرینگیدان بەخۆت بە هەستەکانت بە تەندروستیت بە دڵت و بە مێشکت گرینگیدان بە ڕوحت بە لەش و لار و شێوازی دەرکە وتنەکانت وادەکات هەستی متمانە بەخۆبونت بەهێزتربێت نەوەك لاواز, گرینگیدان بەخۆت شەرم نییە بیکە یاسایەك بۆ ژیانت سوودی لێ دەبینی چونکە ئەوە پێویستییە نەوەك خوودپە رست دەرکەوی.

یاسایەك هەیە لە ژیان ئەویش ئەوەیە کەس نایێت لەجیاتی تۆ ئەوە بکات کە پێویستە بیانکەیت هەرگیز ئەوە بەردەوام نابێت ڕەنگە بە بەردەوامبوونی ئەو ڕێچکەیە کاریگەری بوونت لاواز ببێت و بگرە نەمێنێت, دڵنیام ئەوەی ئێمە دەمانەوێ بیکەین بەرەو پێشبردنی خوودە گرینگیدانیش بە خوودی خۆت ئەو پێویستییە حەتمییەیە کە ناکرێ نەکرێت, بەهەمان شێوە تەرکیزت لەسەر خۆت بەرەوپێشبردنی خۆت خێراتر دەکات چونکە بە بڕوای تۆ ئەگەر سوود لە گرینگی دان بەخۆت نەبینی, ئەوا هیچ سوود لە گرینگی نەدان بەخۆشت نابینی بۆیە بەوە فریو مەخۆ کە خۆپەرستی دەکەیت لە گرینگیدان بەخۆت چونکە خۆت لەپێش هەموو شتێکەوەیت دواجار هەر خۆت باجی ئەوە دەدەیت کە ڕوودەدات نەوەك کەسێکی تر.

لەوانەیە لات سەیربێت کە بڵێیت (چۆن من لەپێش هەموو کەسێکە وەم) بەڵێ خۆت لەپێشـــی هەموو شـــتێك و کەســـێکەوەیت چونکە ئەگەر ئەوە نەکەیت دەبیت بەبار بەســـەر کەســـانی ترەوە, بۆیە بیکوژە ئەو هەســـتە هیچەی پێت دەڵێت گرینگی بەخۆت مەدە و دەســـتبەرداری خۆت ببە با خوودپەرســـت دەرنەکەوی ئەوە ڕێگرێکی یەکلابووەوەیە بۆت, بۆیە ئەگەر ئەمڕۆ ئەوە نەکەیت بـەیـانی بـاجـەکـەی دەدەیت, گرینگیـدان بـەخۆت خۆراکێکـە بۆ خوودی خۆت ئەگەر گرینگی بەو خۆراکە نەدەیت لەهەر ڕوویە کەوە ئەوا ئەو لایەنە لاواز و ســـیس و بێهێز دەبێت بۆ نموونە گرینگیـدان بـە ڕوحی خۆت و دڵی خۆت وەك ئـەوەی خودای گەورە پشتڕاستمان دەکاتەوە و لە سوڕەتی (الرعد) دەفەرموێت: (أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) (٢٨) واتا: ئاگاداربن هەر بەیادی خودا دڵەکان ئارام دەگرن.

خوێندن و خوێندنەوە و بەرەو پێشبردنی هزری خۆت لە بەدەست هێنانی زانیاری نیشـــانەی هێزی باوەڕ بەخۆبوونت دەردەخات بۆیە دڵنیابەرەوە لەوەی ئەگەر بەردەوامی لەســـەر گرینگیدان بەخۆت کەسێکی خۆپەرست نیت و خۆتت خۆش دەوێت, ئەوە بۆ هەموو لایەنەکانی تری ژیان ڕاســـتە گرینگی بە چی بدەیت هەر ئەو شتە بەرەو پێش دەچێت و چی شتێکیش پشتگوێ بخەیت هەر ئەو شتە بەرەو دواوە دەچێت.

دەڵێن پیـاوێکی پیری دانـا بە کوڕێکی گەنجی گووت لە نێو منـدا دوو گوورگ هەن بەردەوام شــــەڕ دەکەن، یەکێکیان پڕە لە ڕق, تووڕەیی،درۆ و فێڵ، ئەوەی تریش پڕە لە خۆشـەویستی و شـادی و ڕاسـتگۆیی و ئاشـتی, ئەم شـەڕە لە نێو هەموو کەسـێکدا هەیە! گەنجەکە پرســـی"کام گورگەیان شـەڕەکە دەباتەوە؟" پیرە پیاوەکە لە وەڵامـدا گوتی: "ئەو گوورگەیـان کە بەخێوی دەکەیـت و خواردنی پێدەدەیت" لێرەدا مەبەســـت لەوە ئەوەیە ســـاویلکە مەبە بەرامبەر هەستەکانت وریابە و ژیربە دڵنیابە خۆشبەختی بەدواتدا دەگەڕێت ئەگەر بەوجۆرە کاربکەیت.

# هەڵەکانم..!



ئەگەر پرسـیارم لێ بکەیت دەربارەی هەڵەکانم کە پەشـیمانم لێیان یان پەشیمان نیم ئەوا بێ دوو دڵی دەڵێم هەردووکیان!!!.
لەبەر ئەوە پەشـیمانم لەوانەیە ئەو کارە کاردانەوەی خراپی لێ کەوتبێتەوە, لەبەر ئەوە لێی پەشـیمانم کە هەڵەیە و دانی پێدا دەنێم کە هەڵە بووە و کردوومە هەموو مرۆڤێکیش لەسەر زەوی قابیلی هەڵە کردنە و هەڵە دەکات خودای گەورە مرۆڤی بە لاوازی دروست کردووە لە هەر ئانوســـاتێکدا دەکرێت هەڵەیەك بکەین بەڵام ئەوە بیانوو نییە بۆ ئەوەی تاقیان بکەینەوە, لە ئەنەســی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێبێت کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: (كلُّ بني آدم خَطَّاءٌ, وخيرُ الخَطَّائِينَ التوابون)( هەموو نەوەیێکی ئادەم هەڵە و گوناە دەکات و باشترین گوناهکارانیش ئەوانەن کە تەوبە دەکەن).
لەبەر چەند هۆکارێك دەڵێم پەشـیمان نیم لەوانە هەرکارێك لە هەر کات و شوێنێکی ژیانمان کردبێتمان بە قەناعەتی تەواوی ئەو کاتە کردوومانە و لەوانەیە شـــارەزاییمان لێی نەبوبێ یان نەمانزانیبێ کە کارەکە هەڵەیە یانیش دەکرێ فێر نەکرابین و ئەزموونمان

نەبوبێ, پەشــیمان نیم لەبەر ئەوەی بە ئەزموون کردنی ئەو کارە لێوەی فێربووم کە هەڵەیە لە کاتێکدا درکم پێی نەکردبوو, پێویستە ســوودی لێ وەربگرین و دووبارەی نەکەینەوە بە دووبارە کردنە وە و بەردەوامبوون لەســەر هەڵەکان وا دەکات پەشــیمان بینەوە لێی, پێش ئەوەی بگاتە ئاســتێك هەڵەکان لە کۆنترۆڵ دەربچن دە رئەنجامێکی خراپ دروســت بکەن دەســتبەرداریانبە, ئەگەریش سوودت لێی وەرگرت و کردت بە وانەیەك بۆ ژیانت ئەوکات لێی پەشــیمان نابیتەوە چونکە بووە بە دەروازەیەك بۆ کردنەوەی ڕێگایەکی ڕاســت و نوێ, بزانە ئەوکاتە ســوودت لە هەڵەکان وەرگرتووە کە دووبارەیانت نەکردۆتەوە.

دەکرێت سوود لە چەند شتێك وەربگریت بۆ جیا کردنەوەی هەڵە و چەوتییەکان و ڕاستی و دروستییەکان وەك سوود وەرگرتن لە هەڵەی کەسانی تر بزانی کە کارێکیان کردووە و ئەزموون کراوە و هەڵەیان کردووە ئەگەر دووبارەی بکەیتەوە و بێ گومان بیت لە وەی کارێکی هەڵە دەکەیت ئەوکات دووجار هەڵەت کردووە!!!.

دەرچوون لە کلتوری کۆمەڵگا و پێشـێلکردنی پیرۆزییە ئۆلییەکان بە هەموو ئۆلییە جیاوازەکانەوە و پێشــێلکردنی مافی مرۆڤ و ئاژەڵ و ژینگە, بریندارکردنی هەســتی بەرامبەر و دەربڕینی وشــەی ڕوخێنەر هەســتنەکردن بە بەرپرســیارییەتی و نەبوونی ئامانج لە ژیان و بەڕێکردنی کاتە بەتاڵەکان بەبێ ئەوەی هیچ شـتێکی بەســوود بکەیت, چەندین شـتی تر هەیە کە دەکرێت هەر مرۆڤێکی ئاســایی جیای بکاتەوە و بیزانێت کە هەڵەیە و ناکرێت ئەنجامیان بدات.

دەبێت فێربین گرنگیدان بەخۆمان لە ڕووکاری ناخ و دەروون و هەســتەکانمان و ڕووکاری دەرەوە و کار و کردەوە و هەڵوێســتە کانمان خۆپەرســتی نین, گرینگی بەخۆت بدە و هەڵەکانت بە بابەتی بکە و لێیان بکۆڵەوە تا بگەیت بە دەرئەنجامێك دواجار چاکیان بکەیت چونکە لە فەرهەنگی ببە بەخۆتدا هەڵە و دۆڕان بوونی نییە یان ئەوەتا فێردەبێت یانیش دەیبەیتەوە, هەمان هە

ڵوێســت بۆ کەســی بەرامبەر بەخۆمانیش ڕاســتە کاتێك تێبینی هە ڵەیەك دەکەیت بەشـێوازێکی ڕێك و جوان ئەو کەســە لە هەڵەکەی یان کەم و کوڕ یەکەی ئاگادار دەکەینەوە بێ ئەوەی دڵی لێمان بڕەنجێ یـان پێش ئـەوەی بـەو کـارەی دڵمـان لـە ئـەو بڕەنجێ لـە شـــوێنێك بەتەنیا و بێ ئەوەی بیشـــکێنینەوە ئاگاداری دەکەینەوە باشـــترە ســـتایش کردن لەبیر نەکەین بۆ ئەوەی قســـەکانمان وەربگیرێن ســتایشـێکی پێشـوەختە کاریگەری ڕەخنەکە زیاتر دە کات, دکتۆر و نوســەری دیاری فارس( مەحمود موعەزەمی) لە پـەیڤێکی جوانـدا دەڵێـت: (لـە هـەڵـەکـانم بکۆڵـەوە و بـەخۆم بڵێ, دروستترە لەلام لەوەی لەلای کەسێکی تر گلەییم لێ بکەیت).

# ئازابە لەخۆ بەڕێوەبردن!

لەوانەیە بپرسیت چۆن ئەوە بکەم و بە بوێری و چاو نەترسییەوە ژیانی خۆم بەڕێوە ببەم و هەموو توانای خۆم بەوە نەبەستمەوە کە (بەبێ یارمەتی کەسانیتر هیچم پێ ناکرێت) ژیانی ئادەمیزاد بە کۆمەڵە و هەر بەوشێوەیەش بەردەوامی پێدەدرێت, تۆ پێویستت بەیارمەتی کەسانی تر دەبێت لە فێربوونت لە بەرەو پێش چوونت چونکە لەوەیە ئەو ئەزموونەی کەسێکی تر هەیەتی و بەتۆی دەبەخشێ بە ئاسانی نەتوانی خۆت بەدەستی بهێنیت, کەوایە ئەوە



هەڵەیە ئەگەر وابیربکەیتەوە کە بەبێ یارمەتیدانی هیچ کەسێك دەتوانیت فێری هەموو شتێك ببیت و سەرکەوتووبیت لە هەر کارێك کە ئەنجامی دەدەیت بەڵام بەڕێوەبردنی ژیانت تەواو جیایە لەو باسە ئاڕاستەی ژیانکردن و چۆنییەتی ژیانکردنی تۆ و ئەو ڕێگایەی کە دەتەوێ پێیدا تێپەڕیت خۆت هەڵی دەبژێریت نەوەك کەسی تر, ئەگەر وانەکەیت ئەوا کەسی تر نایێت لەبری تۆ باجی

هەڵەکانت بدات بەڵکوو هەر خۆتیت کە باجی هەموو ئەو هە ڵانەت دەدەیت, با هەنگاوەکانت لەدەســتی خۆت بن چونکە جگە لەخۆت هیچ کەس هەســت بەو ژیانە ناکات کە تێیدایت و لەو بارودۆخەشی کە تێیدایت هەر خۆتی هەستی پێ دەکەیت بەڵام ئە وەشت بیربێت سوود لە ئامۆژگارییەکانی دایك و باوك وەربگرە و گوێڕایەڵیان فەرمانێکی ئاسمانییە و خۆشەویستییەکی بێ سنوور و بێ مەرجیان هەیە بۆت هەروەها ڕاوێژی کەســە دڵسـۆزەکانت کە بە کردار بۆیان سـەلماندویت نەوەك بە قسـە بە هەند وەربگرە و هەڵسـەنگاندنی بۆ بکە کە ئایا تا چەند گونجاوە بۆتۆ و ڕەنگدانە وەیان چی دەبێت لەســەر ژیانی تۆ ئەوکات بۆتۆ ڕوون دەبێت کە چی دەکەیت و دەتەوێت چی بکەیت.

مەبە بە دیلی هیچ کەســێك و وەك تۆپێك یاریت پێ بکات بە چی ئاڕاســتەیەك بیەوێت بەرەو ئەوێت ببات خۆتبە و ببە بەخۆت بڕیارەکانی ژیانت با خۆت بیاندەیت خۆت بیرکردنەوە و ئایدیای خۆت دروسـت بکە و هەڵسـەنگاندن بۆ هەر شـتێك بکە لەهەموو ســاتێکدا لە هەر بارودۆخێکدا لە هەر ڕوداو و باســێکی ڕۆژدا خۆت خاوەنی بیروڕای خۆتبە بۆ ئەوەی بوونی خۆت بســەلمێنی و خاوەن بڕیار و قســەی خۆتبی لەهەر بابەتێك کە پەیوەندی بە تۆوە هەیە و کاریگەری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ژیانت.

بەرپرسیارییەتی بگرە ئەستۆ و متمانەت بەخۆت بێت کە دەتوانیت هەموو ئەو هەنگاوانەی لە پێشتن بیانبڕیت بێ ئەوەی دوودڵ بیت لە گومان کردن لە تواناکانی خۆت چونکە بە گومانکردن لە تواناکانی خۆت زیاتر لە دەرگایەك بەڕووی خۆتدا دادەخەیت و هەنگاو بەرەو دواوە دەنێیت! ئەوەش خراپەیەکە لەگەڵ خودی خۆتدا دەیکەیت, لەهەر شــوێنێك دابویت لەهەر کارێك و ژینگەیەکی گونجاو هەلێکت هاتە بەردەســت بۆ وەرگرتنی بەرپرسیارییەتییەك لە شوێنێکی دیاری کراو ڕەتی مەکەوە و تاقی بکەرەوە ڕۆژێك دێت شــانازی بە دەســتکەوتەکانت دەکەیت و

پەشـــیمان نابیتەوە لەوەی هەمیشـــە هەوڵی ئەوەت داوە کە خۆت بەرەو پێش ببەیت و لە هاندانی ناوەوەی خۆتدا بویت بەوەی کە دەتوانیت بەرپرســـیارییەتی و بەڕێوەبەری لەبری بارێکی قوڕس لەسەر شانەکانت وەك چێژێك وەربگریت لە ژیاندا.

## له پێناوی خۆتدا خۆت بناسه!

لەو کاتەوەی هەســـــت بە بوونی خۆمان دەکەین ڕابردوویەکی دوور و درێـــژ (بـــه خــــــۆشــــــی و ناخۆشــــییەکانییەوە) و ئێســتایەکی بەردەوام و داهــاتوویــەکی نــاديــار دەبینین, بۆیە خۆناسین لــەپــێــنــاوی خــۆتــدا پێویســـــتییــەکی بێ گوومــانــە و کــاتی پێ مەکوژە بەڵکو هەوڵی بۆ بدە.



دەمــەوێ پێــت بڵێم (ئـــەگـــەر خـــۆت نــەنــاســـیــت, نــابیت بــەخۆت) کــارەکتــەری مرۆڤ ئــەگــەر خۆی ڕۆڵـــی خـــۆی تـــێـــدا نەبینێت هەرگیز ســـــە رکــەوتوو نــابێــت ئــە وەش سەرچاوەکەی لە خۆناســــینەوەیە, بۆیە جـەنگێکی حـەتمی لـە دەروونی خۆتـدا ئـەگـەر هـەبێت جـەنگی خۆناسینە لەپێناوی بوون بەخۆت.

قەڵاچۆی ڕووە شازەکان کە هەرگیز لەگەڵیدا ئاسوودەنیت و حەز بە ئاشنایەتیان ناکەیت جەنگی ڕزگارییە لە دژی کۆیلایەتییەك کە بیر و هەســـت و دەروونی خۆتی لێ ڕزگار دەکەیت ئەوەشـــیان

پێویستی بە کەرەستەگەلێکی مەعنەوی هەیە و دواجار وادەکات ئاشنای هەموو ڕووە ناحەز و ناخوودییەکان بیت کە نەك پێویست نین لەتۆدا هەبن بەڵکو هەڕەشەن لەسەرت.
سێکوچکەی پێکهێنەری گرینگترین پایە (پرسیار و بەدواداچوون و هەڵسەنگاندن)ە بۆ هەر بابەت و باس و پرسێکی نوێ کە سەرهەڵدەدات لە دەروونی تۆدا, خۆت بناسە بە پرسیارکردن و بە بەدواداچوون لێکدانەوەی بۆ بکە و بە هەڵسەنگاندن وەڵامی بدە وە ئەوکات دەگەیت بە ئەنجامێکی دروست دەشێت ئەوە بۆ کارێك یان بڕیارێك یان بەرکەوتنێکت لەگەڵ هەرکەس و شتێك بەکاربێنیت.
مەعریفە یارمەتیت دەدات بۆ خۆناسین و جیاکردنەوەی بابەتە نوێیەکان و کۆنەکان خوویێکی تازەو ئاکارێکی شاز کە دەکرێت ئاشناییت پێیان هەبێت یانیش ئاشنای نەبیت, گرینگترین شتێك کە قسەی لەسەر بکرێت ئەوەیە کە مەعریفە هەم هۆکاری بەرکەوتنە نوێیەکانت بۆ ڕوون دەکاتەوە هەم سوود و زیانەکانیت بۆ دە خاتەڕوو, دەوڵەمەندکردنی مەعریفەی کەسیت دەکرێت لە ڕێگای زانستێکی تایبەتەوە بێت یان خوێندنەوەی بابەتەکانی بەهێزکردنی کەسی و ناسینەوەی هەمەکییەتی پرسێکی دیاریکراوبێت.
دەرچوون لەهەر گێژەلووکەیەك کە ڕوونە و ئاشکرایە سوودی بۆت نابێت درێژەپێدەری ئەو جەنگە ڕزگارییەیە کە لەپێناوی خۆتدا جەنگی بۆ دەکەیت جەنگێکی ناوەکی کە جگە لە سوودگەیاندن بەخۆت زیان بە زیانەکان دەگەیێنێت کە ڕەنگە لە داهاتوویێکی نزیك پێت بگات, هیچ کات درەنگ نییە بۆ ئەو جەنگە ئەوکاتە نەبێت کە بڕیاری درێژکردنەوەی ماوەی بەر لە جەنگەکە دەدەیت چونکە حەتمیە و دەبێت بکرێت ئەگەر وانەکەیت دەبێت دان بەوەدا بنێیت دۆڕاندووتە لەو جەنگەی لە پێناوی بوون بەخۆتدا دەبوو ئەنجامی بدەیت, خۆت بناسە.!

**کاربکە, ئەزموون وەربگرە, فێربە!**

زۆرجاران کە داوای هەلی کار دەکەین گوێبیستی ئەوە بووین کە کەســـێکیان پێویســـتە شـــارەزاییەکی هەبێت لەو کارە و لەپاڵیدا ئەزموونی کاری هەبێت, تۆش یان بڕوانامەکەت لەگەڵ کارەکەدا دەگونجێ یانیش شـــارەزاییت هەیە و دەتەوێ بچیتە نێو کارەکەوە بەڵام ئەزموون ڕێگرە لەبەردەمت باشتر وایە لەو کاتانە بە پارەی کەم بە تاقیکردنەوەی کاری نزيك لەو کارەی کە دەتەوێ یانیش هەر کارێکیتر کە دەزانیت لێیەوە دەتوانیت ســەرکەوتووبیت تەنها تاقی بکەوە تواناکانت دەیســـەلمێنن بەزوویی کە زۆر شـــتی نوێ فێردەبیت, تۆ ئەگەر ئەمڕۆ دەســـتپێبکەیت دڵنیابە لەوەی بەر هەمە کەی بۆ داهاتوو مسۆگەر دەکەیت.

دڵنیــابــە لــەوەی دەتوانیــت کــاری جۆراوجۆر تــاقی بکــەیتــەوە دەتوانیت بەردەوامی بدەیت بە برەودان بەو شـــێوازی کارەی کە خۆت پێت باشـــە و هێواش هێواش ئەزموون وەردەگریت هەوڵدە لێهاتویی خۆت بدۆزیتەوە لەچ بوارێکە برەو بە تواناکانی خۆت بدە, گرینگ نییە ئەگەر لە تەمەنێکی ســـەرەتایی دایت و هێشـــتان کارێکی ســـــەربەخۆت نییە چونکە ئەوە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە هەرگیز نابیتە خاوەن کار و پیشـــەی تایبەت و پســـپۆڕی خۆت ,



دەتوانیت لەڕێگای تاقیکردنەوەی کاری جیاوازەوە یانیش برەودان بەو کارەی کە دەتەوێ لە ڕێگای خوێندنەوەی کتێب وشوێنکەوتنی پەڕە و کەناڵە تایبەتەکانی نێو (تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان) گرینگ ئەوەیە ئاستی زانینت بەرز بکەیتەوە تەنها سوود وەربگرە بەهەر شێوازێك بتەوێ و چێژی لێوەربگریت, (چارلز ئێسپێنسێر چاپلن) هونەرمەند و ئەکتەری سینەمایی بەریتانی دەڵێت: (گوێ لە هەموو کەسێك بگرەو لە هەموو کەسێکەوە فێربە, چونکە کەس هەموو شتێك نازانێت, بەڵام هەموو کەسێك شتێك دەزانێت) تەنها بێ هیوا مەبە لەوەی دەتوانیت چونکە ئەو کاتەی بێ هیوا دەبیت بەرامبەر بەخۆت ئەو متمانەیەی خودا دەشکێنیت کە بەتۆی هەیە.
پێویستە لەسەرت هەر کارێکت ئەنجامدا و گەیشتیت بەهەر وێستگەیەکی نوێ لە ئەزموونکردنی کارێکی نوێ و هەوڵێکی نوێدا لەبری ئەوەی خۆت لە کارەکەدا ببینیەوە و ون بیت لەنێو گێژاوی ئەو ئاڵۆزیەدا کارێك بکە کە لەخۆتدا ببینییەوە واتا ئەگەر دوو بژاردەی کردنی کارێك کە خۆتی لەناو ببینیتەوە و کردنی کارێك کە لەخۆتدا ببینییەوە ئەوەی دووەمیان هەڵبژێرە دەستکەوتی زیاتر و ئاسودەیی زیاتری لێوە وەدەست بخە, چونکە هەمیشە ئەو کارانەی کە خۆت لەناویاندا دەبینییەوە لەناویدا بچوکتر و بێ تواناتر دەردەکەویت بەڵام ئەوکاتەی کە کارێك تاقی دەکەیتەوە کە لەخۆتدا دەیدۆزیتەوە دەتوانیت جیاوازتربیت.
تاقیکردنەوەی کاری خۆبەخشی لە ناوەندە جیاجیاکان و ڕێکخراو و کۆمپانیا جۆربەجۆرەکان و کەرتە گشتی و تایبەتەکان یان هەر شوێنێکی تری بەردەست, پاشان هەوڵدان بۆ بەرەوپێش بردنی خۆت لەو بوارەی دەتەوێ تێیدا بەردەوامبیت, ئەوە وادەکات خەڵکانێکی زیاتر بناسیت و دەستی هەماهەنگیت لەگەڵیاندا یەکبخەیت, شەرم مەکە لەهیچ کارێك کە بە ماندوو بوون و بە سەربەرزییەوە دەیکەیت و خزمەت و بەرهەم و دەستکەوتێك بەخۆت و بەکەسانی تریش دەگەیەنی, لوتکەی ئاسوودەیی دەروون لەو کارەوە وەدەست دێت کە هەم سوودێك بەخۆت و

هەمیش بەکەسـانێك دەگەیەنیت, وە باشـترین فرۆشـتن ئەو فرۆشـتنەیە کە لەسـەر بنەمای چۆنییەتی بێت نەك چەندێتی ئە وکات دووردەکەویتەوە لەهەموو ئەگەرێك کە وابکەن بتکەن بە کەسـێکی دووتا و متمانەی هەمیشـەیی بەدەسـت دێنیت کە گەوهەرێکی بەنرخە.

لەسـەردەمی تەکنەلۆژیا و هۆکارە جیاوازەکانی گەیاندن تۆ دەتوانیت زۆر بە ئاسـانی زانیاری و تەنانەت ئەزموونیش کۆبکەیتەوە بڕوانامە و کاری جۆراوجۆر بەدەسـت بێنیت, تە نانەت کاریگەرییەکەیان بەجۆرێکە دەتوانن تەواوی هاوکێشـەی ژیانت بگۆڕن و لاپەڕەی یەکێ لەو تۆڕە کۆمەڵایەتیانە بەسـە بۆ ئەوەی ئامانجەکەت لێ ون بکات یانیش بەو جۆرە سـوودی لێوەر بگریت کە پێویستە بۆتۆ, هەموو ئەوانە بۆ خزمەتی تۆ دروست بوونە ئەوە خۆتیت هەڵی دەبژێریت کە چۆن بەکاریان دێنیت هیچ کەسێکیتر ئەوە ناکات تەنها خۆت ژیرانە مامەڵەی لەگەڵدا بکە.

**ڕابردوو نابێتە پێوەر بۆ چاککردنی داهاتووت!**

هەموو کارێکی ئەزموون نەکراو ســـەرەتای دەســـتپێکردنی زۆر قورســـە و کۆســـپ و تەگەرە و بەرز و نزمی دێتەڕێ ژیانیش بۆ مرۆڤ بە هەمان شـــێوەیە, دەکرێ ناخۆشـــی زۆرت تێپەڕاندبێ ئازیزێکت لەدەســت دابێ یان لە قۆناغێکی خوێندن دواکەوتبی یان



بـەهۆی بـارودۆخێکـەوە وازت هێنـابێ یـانیش خـەمت هـەیـە و دەرگـاکـان بـە داخراوی دەبینی وا دەزانی هـەموو دەرگـاکـانـت بەڕوودا داخراوە ئەوەی لە ڕابردوو ڕوویدا تێپەڕی ناکرێ هیچ یەکێك لە ئێمە لە ڕابردوو بژیت هەموو کات وابزانە لە دەستپێکی ژیاندایت و هەموو کۆســـپێك بە هەوڵێکی نوێ تێبپەڕێنە لەبەر ئە وەی هیچ ئەرکێك لە دوونیا ناخرێتە ســەر شــانی ئادەمیزاد ئەگەر

بەدەربێت لە تواناکانی,بۆیە لە ڕابردوو مەژی و بەردەوامبە لە بەرەو پێش چوون و بەردەوامی بدە بە ژیان بۆ ئەوەی ببیت بەخۆت, (دکتۆر کەریم شەریف قەرەچەتانی) مامۆستای زانکۆ دەڵێت: )گرینگ ئەوە نییە لە ڕابردوو چیت کردووە و توشی چی بویت, گرینگ ئەوەیە ئێستا چی دەکەیت و بەنیازی چیت؟) ئەوە هەوڵ و ماندوو بوونی ئەمڕۆیە کە بونیادی بەیانیت بۆ دەنێت کارکردنەکانی ئەمڕۆیە کە سبەینەیەکی جوان و باشت بۆ دروست دەکات, ئەو ڕابردووەی کە خەمی بۆ دەخۆیت فریات ناکەوێت تە نها ئەوەی لە دەستت بێت ئەوەیە لە ڕابردوو نەژیت ئەمڕۆ کار بکەیت و سبەی بونیاد بنێیت, (مۆرگان فریمان) ئەکتەری سینەمایی ئەمریکی دەڵێت: (چاوەڕێی سبەینەیەکی باش مەکە کاتێك تۆ بیر لە دوێنێ دەکەیتەوە).

شتگەلێکی زۆر هەن کە دەکرێت شانازیان پێوە بکەیت ئەگەر لەشێکی ساغت هەیە ئەگەر مێشك و دڵێکی تەندروستت هەیە و دەتوانی بەکاریان بێنی کەسانێك لە چواردەوری تۆن, وابکە هە ست بە خۆشبەختی بکەیت پێویستە سوپاس گوزاربی لەسەر ئەو پاداشتانە کە لەسەر دونیا پێت دراون, نوسەری گەورەی ئەمریکی (زیگ زیگلەر) دەڵێت: (ئەگەر خێزانێکت هەیە کە خۆشیان دەوێیت وە هەندێك هاوڕێی باشت هەیە و مێزێك هەیە نانی لەسەر بخۆیت سەقفێك لەسەر سەرت هەیە, ئەوا تۆ زۆر دە وڵەمەندیت) سوپاس گوزاربە لەبەر ئەوەی زۆرکەس هەن کە خاوەنی ئەوەندەش نین باوەڕیت بەو بەشە هەبێ کە بۆتۆ داندراوە تا زیاتر تاقی بکرێیەوە پاداشتی گەورەتر چاوەڕوانت دەکات هەوڵدە و زاڵبە بەسەر بارودۆخە سەختەکان.

خۆ ئەگەر نەخۆشییەکت لەگەڵدایە دڵنیابە لەوەی خۆشەویستی خودایت, خودای گەورە تاقیت دەکاتەوە نەهاتوینەتە سەر دونیا تەنیا بۆ ئەوەی لە خۆشیدا بژین هەست بە خۆشییەکان بکەین و ناخۆشی و نەخۆشیمان بۆنێ هەرچەند نەخۆشبی و ئازارت هەبێت خەڵکی لەتۆ نەخۆشتر هەیە و ئازاریان زیاترە هەرچەند

ئازاری زۆرت چەشــتبێ و ڕابردوێکی تاڵت هەبێ و هەســت بە تەنیایی بکەیت خەڵکی لەتۆ خاوەن ڕابردووی تاڵتر و تەنیاتر هەن بۆیە هەمووکات چێژ لە ئازارەکان ببینە و زاڵبە بەسەریان دڵنیابە لـەوەی خودای گـەورە تۆی لـەبیر نـەکردووە و ڕۆژێـك بۆتۆش هەڵدێت ئەوە بەڵێنی خودای گەورەیە و لە سـورەتی (الشــرح) دە فەرمویێت: ( إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا )٦) فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ )٧) وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَبْ) ٨) )واتـا بێگومـان لـەگـەڵ هـەموو تـەنگـانـەیـەکدا خۆشــی و ئاســانی دێت ئەمجا کە لە کارێك بویتەوە خۆت ماندوو بکە (بەکارێکی تری چاکەوە) وە هەر لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە ( بۆ کارەکانت) ,تاکە دەرگا کە لە هەموو بارودۆخێکدا بەڕووتدا کراوەیە دەرگای پەروەردگارتە هەمووکات داوا لە ئەو بکە چونکە پەروەردگارە خاوەنی هەموو شتە.
لەهەر ئانوســـاتێکدا توانای گۆڕانکاریت هەیە لەخۆتدا گلەییت لە ڕابردووی خۆت هەیە و خەمی پێدەخۆی بەڵام ڕابردوو تێپەڕی پێویســـتە لە ئەمڕۆ بژیت تا بەیانی ڕۆژێکی جیاوازبێت بۆت هاتاکو لە داهاتووت حەســـرەت بۆ ئێســـتا نەخوازیت کە بووە بە ڕابردوو لە ئێستادا بژی لە داهاتوو شـانازی بەخۆتەوە بکە, بزانە کە تۆ کێیت لەکوێ دەژیت و لەکوێ کار دەکەیت مادەم تۆ لە ئەمڕۆ دەژیت هەموو شتێك بەلاوە بنێ کار بۆ ئەمڕۆیەکی باشتر بکە و لە ئێســتادا دەســت پێ بکە چونکە ئەو بەیانیەی چاوەڕێی دە کەیت هەر دەبێت بە ئەمڕۆیەکی چێژ بەخش و ئاســـودەت دەکات ئەوکاتەی بەرلەوە ئامادەکاری بۆ کرابێت, چیت هەیە لەوەوە دە ست پێ بکە دڵنیابە لەوەی ترست لە بەدەستهێنانی نەبێت ئەوکات پێی دەگەیت.
ژیان بۆ هەریەکێك پڕە لە ئەزموون ناخۆشـیەکانت کە بەســەرت هاتوون دەبن بە وانەیەك پێت پیشـــان دەدەن کە من و تۆ و هەریە کێکمان تەنها خودامان هەیە کە لە هەموو کاتەکانی ژیانمان لەگە ڵمانە لەو ساتەوەی دێینە سەر دونیا تا ئەوکاتەی دەمرین و بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە خۆ ئەگەر کەســـانێك هەن و لەگەڵتن لەهەر

بـارودۆخێکـدا ئـەوەش پـاداشـــتێکی خودایـە بۆت "ئـەوانـەی لـە خراپترین بارودۆخ ئێمەیان خۆشـویسـت شـایەنی ئەوەن تا هەتایە لـە دڵمـان بمێننـەوە" لـە دیمـەنێکی فیلمی (The fault in our stars) تا ئەوکاتەی مرۆڤ دڵی بەردەوامبێت لە لێدان و هەســت بەخۆی و جوڵەی جەسـتەی بکات و بتوانێ مێشـکی بەکار بهێنێت کـاتی مـاوە بۆ ئـەوەی بـە خـەونـەکـانی بگـات گرینـگ نییـە لـە چ تەمەنێکی هیچ کات ژیان بۆتۆ کۆتایی نەهاتووە هەموو بەیانییەك کە لەخەو هەڵدەستیت دەرفەتێکە بۆت کە بریار دەدەیت ئەو ڕۆژە چی بنوسیتەوە لە پەرتوکی ژیانت با نوسەرێکی خراپ نەبیت.!

## لەگەڵ کەسانی پڕ وززە و ئەرێنی مامەڵە بکە بۆ ئەوەی هەست بە ئارامی بکەیت!

ئەو ژینگەیەی کە تێیدا دەژیت ڕەنگدانەوەی لەسەر تۆ دەبێت ئەگەر خێزانەکەت هاوڕێکانت دەوروبەرت و ئەو کەسانەی لێتەوە نزیکن کەسانی ئەرێنی و پڕ وززەن و هانت دەدەن ئەوکات بزانە شوێنەکەت گونجاوە لە کەسانی گەشبین و پڕ وززە و چالاکی و هاندەر نزیك ببەوە هاوڕێیەتیان بکە پاڵنەرێکە بۆ سەرکەوتنەکانت, (عمر ال عوضە) نوسەری گەنجی عەرەب و وڵاتی سعودییە دەڵێت: (لەگەڵ گەشبینان دۆستایەتی بکە وەك



ئەوان دڵخۆش دەبی) ,هەست بە بوونی وززە و ئارامی و دڵخۆشی دەکەیت ئەوکاتەی دەبینی هەموان لە پشتت وەستاون هانت دەدەن بۆ سەرکەوتنەکانت لەگەڵتن تا ئەوکاتەی نارەحەتییەکان تێدەپەڕێنی ئەوکاتە هەست بە میهرەبانی ڕاستەقینە دەکەیت و لە ماناکەی تێدەگەیت, دوورکەوە لەو کەسانەی وزەی نەرێنی

دەبەخشـــنەوە و وشـــەکانیان بارگاوین بە قســـەی ڕوخێنەر و ڕەشبینانە خەڵکی زۆر هەن کە لە ناخەوە لاوازن, ئەوان بیر دەکە نەوە ناتوانن خۆیان بن و ناگەن بەتۆ بۆیە هەمیشـە سـەرزەنشـتت دەکەن لەســـەر شـــتی بچوك, خۆیان ناتوانن هیچ شـــتێك بکەن ناشــیانەوێ تۆ هیچ بکەیت هەروەك باڵندەیەك کە لە قەفەز لەدایك بووە و هێندەی ترســـی لە فڕین و دەرچوون لە قەفەزەکەی هەیە ناتوانێت جێی بهێڵێت و خۆیشـــی لە ئاســتێکی بەرزتر لەو باڵندانە دەبینێت کە ئازادانە لەو چڵ بۆ ئەو چڵ دەفڕن, بەڵام لای ئەو لە قەرەجێکی بێ ماڵ و حاڵ هیچی تر نین بە هەمان ئاواز و ڕوانین کەســـانی ترســـنۆك و بێ هیوا لە ئاســـتی دروســـتکردنی خۆیان هەنگاوەکانی تۆش بە تاوان دەبینن و وەك ئەوەی دەرچووبیت لە ڕیزی ئەوان, هەســـت بە نامۆیی دەکەم لام ســـەیرە کە دەبینم مرۆڤگەلێکی دەردەداری فکری نـەرێنی و لاواز کـە هیچیان پێ نـاکرێت دەیـانـەوێ هـەموو خـەڵکی وەك ئـەوان بن, پێش ئـەوەی لەخۆیان بپرســن بۆ ئێمە واین دەڵێن بۆ وایت؟ ئەو جۆرە کەســانە پێویستە دەستیان بگیرێت لە سوچێکەوە سەیری خەڵکی نەکەن تا هەســت بە شــتەکان بکەن و ســەرکەوتنەکان ببینن پێویســتیان بە تێکەڵ بونەوەی نێو کۆمەڵگا هەیە چونکە نەخۆشـــن و گیرۆدەی ترس و دابڕان و بێ هیوایی بوونە.

## هۆکاری کێشەکانت بدۆزەوە!

هەر کێشـەیەکی تۆ هۆکارێکی هەیە و لەخۆیەوە دروسـت نەبووە, هەروەك لەکۆنیشەوە وتراوە (هەموو کێشـەیەك چارەیەکی هەیە) تۆش بەدوای چارەسەری هەر کێشـەیەکتدا بگەڕێ بە دۆزینەوەی هۆکاری سـەرەکی کێشەکە و بەزوویی لەکۆڵ خۆتی بکەوە چونکە هەر ســـاتێك لە تەمەنی تۆ دیارییەکە و لەدەســـتی مەدە بەوەی لە



خەمخواردن لە کێشـــەکان بەفیڕۆیان بدەیت هێندەی دانیشـــتویت بەدیار خەمخواردن بۆ کێشـــەکانت بەدوای چارەیەکی دروسـت و هۆکارەکەی گەڕابایت بەزوویی لەکۆڵت بووبوویەوە.

ترس و بێ هیوایی ژیانتی داپۆشـــیوە و هەموو ڕێگایەکی لەتۆ گرتووە و لەنێو چوار دیوار خۆت دەبینیەوە بەتەنها چونکە ترست هەیە لە هەنگاوی داهاتووت و هەسـت بە شـکسـت دەکەیت بێ ئە

وەی هیچ شـتێك ڕوویدابێت وادەزانیت لەنێو شـكسـتێكی گەورەی ژیانتدایت لەخۆت پرسـیوە بۆ؟ چونكە ئەو ژینگەیەی كە بۆخۆتت دروســـت كردووە ژینگەیەكی تەندروســـت نییە بەڵكو ژینگەی دەوروبەرت هۆكاری هەموو ئەوانەن و خۆت لەوە بەرپرسیت بە وەی ڕێگات داوە هەموو ئەوانە ببن, ئەوكاتەی بیرۆكە و هەنگاوە كانت لەلای كەســانێكی بێ ئەزموون و (ترسـنۆك) باسـدەكەیت چاوەڕوانی هاندان و پاڵپشـتیان مەبە چونكە خۆیان سـەر لەوە دە رناكەن ئیتر چۆن بتوانن ئامۆژگارییەكی دروســت بەتۆ بدەن, لە بری ئەوە بڕۆ لای كەســـانی ئاوەز پەســـەند و دەروون پاقژ و باڵاكان و ســـوود لە ئامۆژگارییەكانیان وەربگرە و ورەی خۆت بەرز بكەوە و دەســـتبەرداری هیچ یەك لە خەونەكانت مەبە, لە كۆتا قۆناغی خوێندن دایت و خۆت ئامادە دەكەیت بۆ زانكۆ بەڵام قســـەی یەكێك كە نەخۆی توانیویەتی بگات بەو ئاســـتەی تۆ نە شــارەزایی هەیە لێی با نەتشـكێنێت و چۆكت پێدا نەدات ژینگە و جێگاكەت هەڵەیە و هۆكارەكە ئەوەیە چارەســـەریش تەنها گوێ پێنەدانە و بە پشتگوێ خستنی ئەو كەسانە وزەی ئەرێنی و هاندان بۆخۆت دروســـت بكە چونكە جگە لەخۆت هیچ كەس وەك خۆت بە تەواوی هەست بە تواناكانت ناكات و چیتر لە بری باسكردنی تواناكانت هەوڵدە بیانسـەلمێنە, دەتوانیت ئەوە بكەیت چونكە خۆت هەست بەخۆت دەكەیت نەوەك كەسێكی تر.

گیرۆدەی هەستێكی سۆزداریت و كێشەیەكی گەورەی بۆ دروست كردویت خۆتـت قۆڵبـەســـت كردووە بـەوەی نـە دەتوانیـت ئـەو ڕابردووە لەبیر بكەیت و نە دەشـتوانیت دەسـتبەرداری ببیت .!!
چونكە هێندەی مانەوەت لەو ڕابردووە نیو تۆســـقاڵیش بەدوای چارەســەردا نەگەڕاویت و هۆكاری هەموو خەمەكانت پشـتگوێ خســـتووە و تەركیزت لەبری هۆكاری خەمەكە لەســـەر خودی ســـەرمەســـتی ئەو كاتەت بووە, واز لەوە بێنە و لەمەو بەدوا بڕۆ بەدوای هۆكار بگەڕێ نەوەك تەركیزێكی خەمخۆرانە كە بێ دە ســـەڵات دەتوەســـتێنێت و ناتوانیت هیچ بكەیت, هەمیشـــە بەدوای

دیمەنە ســـۆزداری و ئاوازە غەمگینەکان دەگەڕێیت و کۆمەڵە هاوڕێیەکی بێ هیوات لە دەورت کۆکردۆتەوە و دوورکەوتوویتە وە لە یادی خودا! چاوەڕێی ئەوەش مەبە ژیانت بەرەو باشـــبوون بچێت, هەرکوەکو لـە قورئـانی پیرۆزدا لـە ســـورەتی (الرعد) خودای گـەورە ئـامۆژگـاری بـەنـدەکـانی دەکـات و پێمـان دە فەرموێت:(الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ ۗ) (٢٨) واتا: ئە وانەی کە بڕوایان هێناوە دڵیان ئارام دەبێت بە یادی خودا.

# مەزن بە!

لە سەرەتای دروست بوونی مرۆڤایەتییەوە جۆرەها مرۆڤ بوونی هەبووە کەســـانێك هەبوونە تێکدەر و ئاژاوەچی بوونە یان بکوژە کـان و دیکتـاتۆر و خوێنمژەکـان و فـەرمـانڕەواکـان ســــەربـاز و هەژار و جوتیار و دەرەبەگ و خاوەن سارمایەکان و کۆیلە و چە وســـاوەکان...هتد جۆرەها چین و توێژی جیا بەپێی ســــەردەم و بارودۆخ و شــوێنەکان هەریەکەیان بوونەتە چیرۆکێك بەشــێکیان ون بوون و لەناو چوون بەشێکیان بوونە ئەرك بەسەر دەوڵەت و بەســەر خەڵکی تر سـوودیان نە بۆخۆیان و نە بۆ خەڵکیش نەبوو, بەشێکی تریان سەربەرزیان بۆخۆیان و خانەوادەکەیان جێهێشت



بەشــێك لە ســەرکردەکان بۆ هەمیشــە نەفرەتیان لێ دەکرێت و بە نەفرەتەوە لە هەر لاپەڕەیەکی مێژوودا ناویان هاتووە بوونەتە مایەیماڵوێرانی و کوشتنی مرۆڤایەتی, بەشێکی زۆریش لە سە

ركردەكـان وەك ڕزگـاركـەر نـاویـان هـاتووە كـە بوونـەتـە جێی شانازی خۆیان و وڵاتەكەشیان.
ئەوە خۆتی بڕیار لەسـەر ئەوە دەدەیت دەبێت بەكێ كەسـێكی سـە ركەوتوو و بە بەرهەم دەبێت یان دەبێت بە ئەرك بەسەر خانەوادە كەت و خەڵكیشەوە وابكە شانازیت پێوە بكرێت لەهەر شوێنێك كە باس دەكرێی و ناوت دەهێندرێت جێگای شانازی هەركەسێك بێت ئەگەر بۆ جارێكیش قســـەت لەگەڵی كردبێت و ناویت هێنابێت, لەبری ئەوەی هەمیشـــە دەم بە گلەیی بیت ئەوەی پێت دەكرێت بارودۆخەكان لە بەرژەوەندی خۆت بگۆڕە بەڵام لەســەر حســابی كەس نەبێت بەرژەوەندییەكانت, هەرچییەكیش لە توانای تۆ بەدەر بوون نـەتتوانی بیـانگۆڕیـت خۆتی لـەگـەڵ بگونجێنـە بـەپێی بارودۆخەكە لەوە باشترە دابنیشیت بەدیارییەوە چونكە ژیان زۆر لەوە كورتترە كە تەمەنی خۆت لەسـەر بارودۆخ و شتێكی جێگیر دابنێیت كە گۆڕانكاری و هەڵسوڕانی لەدەست تۆ نەبێت.
چ كـاتێك دەبێتـە تـاكێكی مـەزن؟ ئـەوكـاتـە كـە بزانی لـە چیدا گەورەیت و لەچی كردارێكدا بچوكیت, ئەوكاتە پیاوێكی مەزنی ژنێكی مەزنی كەسـێكی مەزنیت كە چاكەو خراپەكانی خۆت لەیە كتر جیا بكەیتەوە بزانیت چی بۆتۆ باشــە و چی شـتێك زیانمەندت دەكات, ئەمما ئەگەر تا ئێســـتا ئەوە نازانیت بزانە كە هەرچەند تەمەنێكت هەبێت بەڵام نەتتوانیوە ئەزموونی لێوە وەربگریت, نوسـەری بەناوبانگی ئەمریكی (سـتیڤن كۆڤی) دەڵێت: (ئەگەر تۆ كێشــەكەت گەیاندە بەڕێوەبەرەكەت ئەوا تۆ پەیامنێریت, ئەگەر بە پێشنیارەوە كێشەكەت گەیاند ئەوە تۆ ڕاوێژكاریت, ئەگەر بە چارە سەرەوە كێشەكەت گەیاندە بەڕێوەبەرەكەت ئەوا تۆ سەركردەیت) با چارەسەرت بۆ هەموو شتێك لابێت بەڵام تاك لایەنە بڕیار مەدە مەگەر لەسـەر ژیانی تایبەتی خۆت بێت كە لەوەشـدا لە كەسـانێك كە جێگای متمانە بن دەتوانیت ڕاوێژیان پێ بكەیت, بۆیە دووركە وە لە قســـە و بیری لاواز ئاســـا كە ســـاردت بكاتەوە لەســـەر دەربازبوون لەهەر حاڵەتێكی ناجێگیر هەڵســـەنگاندن بۆ هەر

کارێك بکە بە سوود وەرگرتن لە ئەزموونی کەسانی تر و دووبارە نەکردنەوەی هەڵە باو و دیارەکان.
ئاگاداربە هەڵەیەك نەکەیت کە بە درێژایی ژیانت باجەکەی بدەیت هەندێك هەڵە هەن لەوانەیە باجەکەی بە مردن بدرێت وەك هەڵەی ئەو قالۆنچەیەی کە لە هەڵبژاردنی شـــوێنێکی هەڵەوە بەردەبێتەوە یاخود لار ببێتەوە و بکەوێتە ســــەر پشـــت لەوانەیە بۆ هەتایە نەتوانێت بە قاچەکانی بڕوات و چاوەڕێی مەرگی لەســــەرخۆی خۆی بکات, یان هەڵەی ئەو شاخەوانەی بە هەڵبژاردنی ڕێگایەکی هەڵە و دواجار کەوتنی بەدوادابێت و مردن باجەکەی بێت, یان ئەو هەڵبژاردەیەی کە شـــۆفێرێك بە خێراییەکەی دەیکات لەوانەیە لە چەند چرکەیەك ژیانی لێ وەربگرێتەوە, بۆیە وریابە لە هەڵە باوەکان دوورکەوە جیاوازبە لەگەڵ کەســـانی ناحاڵی لە ژیان و دەربازبە لەهەر ئاستەنگێك و بە مەزنی بمێنەوە.

## کەسایەتیت!

هەوڵبدە کەسایەتی تایبەت بەخۆت بۆخۆت دروست بکەیت واز لە هەموو کەسایەتییە فس فس پاڵەوانەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و ئەفسانە و براوەی نێو فیلمەکان و سەرزاری خەڵك بێنە ببە بەخۆت!!.
وابکە کەسایەتییەکی دیار و براوەت هەبێت جیاوازبیت لە دەوروبەرت چۆن خودای گەورە هەمووانی وەك یەك دروست



کردووە بە یەکسانی هەر بەو شێوەیەش بەهرەیەك بەتۆ دەبەخشێت و بەهرەیەك بە کەسێکی تر, هەرکەسێك بۆخۆی چیرۆکێك دەنوسێتەوە ئەوەی کە دەیەوێت ئەنجامی دەدات با چیرۆکەکەت چیرۆکی خۆتبێ جیاوازبێ لەکاسانی تر, دەشێ یە کێ لە ئەندامەکانی لەش لە کەسێك بستێنێتەوە بەڵام بە شێوەیەکی تر بەهرەیەکی پێی داوە کە قەرەبوی زۆر زیاتری ئەو ئەندامەی لەشی بۆ دەکاتەوە بۆ نموونە ئەگەر کەسێکیت بێبەشیت لە چاوێکت یان هەردووکی ئەوا بە دوای بەهرەیەکت دا بگەڕێ و بیدۆزەوە لەوانەیە توانایەکی باشی لەبەرکردنی شتەکانت هەبێ

یان لە تێگەیشتن و بەخشینەوەی زانیاری بەتوانای وە چەندین بواری تر کە تۆ دەتوانی بیدۆزیتەوە و پەرەی پێ بدەی بۆ ئەوەی کەسایەتییەك بۆخۆت دروست بکەیت و ببی بەوەی کە دەتەوێ.
هیچ کات هیچ شتێك وەك بەربەست مەبینە لەپێش خۆت و وابکە لە بەرژەوەندی خۆت ئەوەی کە ناوت ناوە بەربەست بیقۆزیتەوە و خۆت بەرەو پێش ببەیت و هەموو شتێك بکەیت بە هۆکاری بەهێزتر بوونت.
هەرگیز ئاوات بەوە مەخوازە کە ببیت بە کەسێك یاخود راستتر بیڵێین لە کەسێك بچیت لەبەر ئەوەی بارودۆخەکان جیاوازن کەسایەتییەکان جیاوازن هەلەکان جۆراوجۆرن لێ بگەڕێ خەڵکی چۆنن هەروا بمێننەوە کار لەسەر ئەوە بکە خۆت بدۆزیتە وە لەنێو ئەو هەموو جەنجاڵیەی ژیان و دونیا و کەسایەتییە جۆر بەجۆرانەی کە هەن ناکرێت ببیت بە کەسێکی دووبارە و وەك کەسێکی تر بیت, بابەتێکی زۆر گرینگ کە پێویستە پێداگیری لە سەر بکرێت ئەوەیە بەدوای خەونەکانت بکەوە زۆر لەوە نایابتر و گرینگترە بەدوای خەون و هیوای کەسێکی تر بکەوی, بێگومان ئەو کەسەی دەتەوێت وەك ئەوبی کەسایەتییەکە لەبوارێك پێگەیێك ناوبانگێك چیرۆکێکی تایبەت بەخۆی هەیە لەو بوارەی خۆی بێگومانبە لەوەی وەك ئەو نابی بەڵام دەتوانی لەو نایابتربی چونکە هەمووان وەك یەك نابن کەسیش دووبارەی کەسیتر نابێت پێش ئە وەی کات بکوژی بەو خەونانەت کاربکە بۆ ئامانجێکی دیاریکراو لەبەر ئەوەی هەریەکەمان بەشێکین لە کۆمەڵگا و دەتوانین ببین بە نمونەیەکی باش بۆ خەڵکی تر و ببین بە مایەی شانازی بۆخۆمان و بۆ دەوروبەرمان, (لیۆناردۆ دیکاپریۆ) ئەکتەر و بەرهەمهێنەری فیلم و بە ڕەگەز ئەمریکی پەیوەست بەو بابەتە دەڵێت: (تۆ ئەو شتە بەدەست ناهێنیت کە تەنها هیوای بۆ دەخوازیت, بەڵکو ئەو شتە بەدەست دەهێنیت کە کاری بۆ دەکەیت).

## ئارامگری و گومانی باشبردن!

دوو بابەتی زۆر گرینگن پەیوەســتن بە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەوە هەریەکەیان پەیوەندییەکی پتەویان بەیەکەوە هەیە هەموو کات

بیرکردنەوە و گومانەکانت با بە ئاڕاستەیەکی ئەرێنی و باشە بن تا نەکەویتە هەڵەوە, ڕاستە ژیان پڕیەتی لە ناخۆشی و نەهامەتی و کارەسات لەوانەیە خەم و ناخۆشی زۆرت بێنەڕێ بەڵام



هەمیشە پشت بە خودا ببەستە و ئارام بگرە لەوەی کە ڕوویداوە, ئارام بگرە لەسەر خەم و ناڕەحەتی وئازارەکان هێواش هێواش بە تێپەڕبوونی کات لەبیریان بکە, کاتێ بولبولێکت خۆش دەوێت لە ناو قەفەسێکی دەکەیت هەتا گوێت لە دەنگی بێت و (بۆت بخوێنێت)!!..
خوداش کاتێک تۆ توشی ناڕەحەتی و ئازارێک دەکات دەیەوێت پەنای بۆ ببەیت و ئەو لە بیر نەکەیت لێی بپاڕێیتەوە و پەنای بۆ ببەیت نەوەك بە پێچەوانەوە ناڕەزابیت !!..
سروشتی مرۆڤەکان زۆربەی وایە تا ئەوکاتەی دەگەن بە تەنگانە خودایان ناکەوێتەوە بیر زۆرجار نزاکانیش نزای (دونیایین)

باشــترین شــت کە بیکەیت دوای نزاکانی لێخۆشــبوون و ڕۆژی دوایی و بەدەســتهێنانی بەهەشــت...هتد ئەوەیە نزای باشــبوونی ئەمڕۆت بۆ دڵخۆشی سبەی بکەیت, لەبیرت بێت بۆ ڕۆژە سەختە کان ئارامگرتن تا ئەوکاتەی تێدەپەڕێت و بۆ ڕۆژە باشـــەکان ســـوپاســـگوزاری خودای گەورە لەســـەر ئەو نیعمەتەی پێی بەخشـــیوین هەرچەند خراپبێت بۆمان باشـــترین ئەوەیە کە خودا بۆی هــەڵبژاردوین خودای گــەورە لــە ســـوڕەتی )إبراهیم) دە فەرموێت: (وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَـكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَـدِيد) (٧) واتا: (بیریان بخەرەوە) کاتێك پەروەردگارتان ڕایگەیاند سوێندبێت ئەگەر ئێوە سوپاسی( چاکەی) من بکەن ئەوە من بۆتان زیاد دەکەم بەڵام بێگومان ئەگەر ئێوە ســـوپاســـگوزار نەبن ئەوە بەڕاستی سزای من زۆر بەتینە.

بۆیە هەر کات توشـــی نارەحەتیەک هاتی ئەو کاتە بزانە خودا هێشتا خۆشـی دەوێیت و چاوەڕێیە گفتوگۆی لەگەڵ بکەیت، خودا لە بیر مەکەن، خودا لە بیرتان ناکات.

لە ئەبی هورەیرەوە ڕەزای خودای لێبێت پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی خودای گەورە دەفەرموێت: (أنا عند ظنّ عبدي بي) واتا (بەندەکەم چ گومانێک ببات پێم، ئاوا دەبم کە دەیبات) ئیمام قورتوبی رحمة الله دەفەرموێت مانای ئەو فەرموودەیەی خودای گەورە ئەوەیە گومان بردن بەوەڵامدانەوە لەکاتی دوعادا، گومان بردن بۆ قبوڵکردنی تەوبە، وە گومانی لێخۆشبوون لەکاتی داوای لێخۆشبوون کردن،وە گومانی پاداشت لە کاتی کردەوە کردندا.

کەواتە ئاگات لەگومانەکانت بێت بەخوای گەورە، نەکەی گومانی نەرێنی ببەیت بەخوای گەورە چونکە هەرگیز هیچ یەك لە ئێمە نازانین چی شـــتێك بۆمان باشـــە و چی شـــتێك خراپە بۆمان ئەوە خودای گەورەیە بڕیاری ئەوەمان بۆ دەدات کە توشـــی دەبین هەر ئەویشە زانای بەدیهێنەر و هەڵسوڕێنەری زەوی و ئاسمان و ئەو بەگیان و بێ گیانانەشـــی کە دروسـتی کردوون، بۆیە دوودڵ مەبە بەوەی نزاکـانـت قبوڵنـاکـات یـان گـەڕانـەوەت لـە هـەڵـەکـان لێ

وەر ناگرێت یان لێت خۆش نابێت یان بڵێی نەخۆشـــم دەخات و توشی شەڕ دەبم یان شانسم نیە یان ناوچەوانم نایهێنێ یان دەست بۆ چی دەبەم بۆم نابێ یان ڕزقم نادات یان دەرم ناچوێنێت یان ڕەش بینی ســـەر تاپات داپۆشـــێت و خەم بخۆیت چونکە بەوە دەگەیت کە چاوەڕێی دەکەیت, بەڵکو پێویســـتە هەریەکەمان بەپێچەوانەوە بەردەوام گومانی باش ببەین چاوەڕێی خێر و باشـــە بکەین توشــمان دەبێت لە کۆتاییشــدا هەر خودا زانای پێکهێنەری گەردوونە هەر ئەویش کاروبارەکان بەباشــترین شــێواز بەڕێ دە کات.

گومانی خراپ بەکەس مەبە لەوانەیە لە هەڵســـوکەوتی کەســـێك نیگەرانبیت بەڵام ئاگادارنیت لەوەی پێش ئەوەی قســـە لەگەڵ تۆ بکات توشـــی چی بووە لەوانەیە خەمێکی هەبێت نەتوانێت دەری ببڕێت ئەوەش کاریگەری لەسەر شێوازی ڕەفتاری دەبێت, کاتێك کەســـێکت بینیوە خەریکی گوناهێکە هەرزوو هەموو شـــاری لێ تەمەگەیەنە لەوانەیە پاش ئەوە پەشـــیمان بوبێتەوە, کەســـەکان مە شـکێنە بەوەی تووشـی تاقیکردنەوەیەکی خودایی دەبن و لەدەسـتی کەس نییە ڕووداوەکان بگۆڕێ بەویستی خودای میهرەبان نەبێت, بەردەوام بیر لە ســوپاســکردنی خودای گەورە بکەوە و داوای لێ بکە, دڵنیابە ئەو وەڵامت دەداتەوە.

## پەلە مەکە بۆ گەورەبوون!

ژیانی هەرکەســێك بریتییە لەو ســـاتەی کە تێیدا دەژیت, بۆیە لەو ســـاتانە چێژ ببینە کە تێیدا دەژیت ئەگەر ماندوویت کار دەکەیت

دەخوێندیت هەوڵ دەدەیت چێژ ببینە, خۆشـــی وەرگرە لە هەموو شـــتێك, با خەونە گەورەکانت یارمەتیدەرت بن لە پێشـــخســـتن و



سەرخستنت لەبری ئەوەی لاوازت بکەن و ورەت بڕوخێنن, بۆیە چێژ لەو هەوڵانە ببینە کە ئێســـتا دەیاندەیت بۆ جوانکردنی ژیانت لە داهاتوو.
پەلە مەکە لە گەورەبوون چونکە کەس نەیتوانیوە بە هەنگاوێك کیلۆمەترێك لەســـەر زەوی ببڕێت هەنگاوەکانت دیاری بکە بە چ ئاڕاســـتەیەکن دواتر بەرەو پێلی بڕۆ هەنگاوێك ڕۆژێك بخایەنێت و بتبات بۆ ئەو شـوێنەی دەتەوێت باشـترە لەو هەنگاوەی بە خولە کێك دەیهاوێژیت و دەتکەوێنێت, بۆیە پەلە مەکە و زوو یان درەنگی بۆ نییە لەو ساتەی کە کاتی دێت تۆ دەگەیت بەو شوێنەی دەتەوێت تەنها بەردەوامبە لە ڕۆیشتن.

دەبێت فێربیت دونیا دەشـــتێکی پـان و بـەرین و لێژاییـەك نییـە بتخزێنێتە نێو دونیای خەون و خەیاڵەکانت, ئەگەر بە بەرزی و نزمی تێپەڕ بویت ئەگەر توشـــی ناڕەحەتی بویت, دواجار ئەگەر بە ورە بەرزی و بڕوا بەخۆبوونەوە بەرەو پێش چویت هەســـتی سەرکەوتنت زاڵ کرد بەسەر بیانوە بێ نرخەکانت دەگەیت بەوەی بڕوات پێی هەیە کە پێی دەگەیت!.

(جان لوك) بە ڕەگەز (چین)ی و بازرگانێکی شاری کۆڤەرڤی کە نەدایە لە ســـەرەتاکانی تەمەنی ١٤ کۆمپانیای یەك لە دوای یەکی دانا و شـکسـتی هێنا بەبڕوا بەخۆبوونەوە بەرەوپێش چوو دواجار ئێســـتا بازرگان و ملیاردێرە لە چەندین بواری جیا کار دەکات و لەلایەن کەنەدا پۆستەوە ساڵی ٢٠١٨ خەڵاتی باشترین تاکفرۆشی ئۆنلاینی پێبەخشرا وتەیەکی بەناوبانگی هەیە دەڵێت: (سەرکەوتن کاتێك بەدەست دێت کەخەونەکانت گەورەتربن لە بیانوەکانت).

ئەو فشـــارە ناوەکییە قوڵەی لەســـەر خۆتی دەکەیت جگە لەوەی دوات دەخـات هیچ خـاڵێکی ئـەرێنی تێدا نـابینـدرێت بۆیـە کـات بـەخۆت بـدە و پـەلـە مـەکـە گـەورەبوونی تۆ بریتییـە لـە بـەرەو پێشچوونی تۆ, ئەو کاتانەی تەمەن بەرەو هەڵکشانە لەگەڵیدا بەرەو پێشـچوونی پێویسـتە ئەگەرنا زەرەرمەندیت و ئاوڕێك لەخۆت بدە وە بیرێك لـە ڕۆژانی ڕابردووت و ئێســـتـات بکـەوە ئـەوەی کـە دەتویســـت لەو تەمەنەی ئێســـتات پێی گەیشـــتوویت؟ ئەگەر پێی گەیشـــتوویت بەردەوامبە لە نوســـینەوەی چیرۆکی ژیانت بەو پێنووس و خەتەی کە خۆت دەتەوێت, خۆ ئەگەر دواکەوتویت لە وەی کارت بۆی دەکرد هیچ درەنگ نەبووە دووبارە لە تێنوســـی ژیانت لاپەڕەیەکی نوێ هەڵبدەرەوە و دەسـت پێبکەوە چونکە هەر هەوڵدانێکی نوێ بریتییە لە نوێبوونەوەیەك لەژیانی تۆدا بەشێوەیەك باشـــتر لە هەموو نوێبوونەوەکانی تر چونکە ئەزمونێکی زیاتر و باشـــترت بینیوە, تەنها بەردەوامبە پەلە مەکە لە گەورەبوون ژیانی تۆ بریتییە لەو ســـاتەی کە تێیدا دەژیت بۆیە بەردەوامبە و هەوڵی خۆت بدە گۆڕانکاری لەژیانی تۆدا بریتییە لە پرۆســـەیەك

که ئەگەری ســـەرکەوتن و شــکســـتی تێدایە بەڵام پڕۆســـەیەکی بەردەوامە و نابێت کۆتایی پێبێت تەنها بە سەرکەوتن نەبێت, کۆڵ مەدە بە شکستێك لەو هەوڵانەی کە داوتە تەنها ئەوە بکە کە دڵنیات دەکاتەوە لە ئەنجامێکی باش (کۆڵدان-پەلەکردن) لەهەر ئامانجێکدا کۆتاییەکی خراپ دەهێننە کایەوە بۆیە دوور بە لێیان و تەنانەت تاقیان مەکەوە.

### مامەڵەکردن لەگەڵ دووتاگەرایی ( فەلسەفەی دوالیزم)

باســـکردنی بابەتی کەســـایەتی و دۆزینەوەی خوودێکی جێگیر و شایستە بەدەر لە باسکردنی دووتاگەرایی نیشانەیەکی دیارە بۆ کە موکوڕی لە بابەتەکە لەبەر ئەوەی دووتایی بەشـــێکە لە ژیانی

مرۆڤ و له ئەزەلەوە لەگەڵیدا بووە, دەکرێت دووتاگەرایی بە



دیوە خراپەکەی بەکاربهێندرێت کە ئەوەش بەشێکی زۆری خەڵکە نائاگاکان ئەو ڕێچکەیەیان گرتووە و لەهەمان کاتدا دەکرێت دیوە باشـــەکەی ببینین و ئەنجامی بدەین کە ئەوەیان دەگمەنە و کەمتر ڕووبەڕوومـان دەبێتـەوە بـەبـەراورد بـە دیوی یـەکـەمی, لێرەدا پرسـیارێك دێتە ئاراوە کە دەکرێت لەخۆمانی بپرسـین و وەڵامە کەی بەدەست بخەین کە ئایا دووتایی دەبێتە هەڕەشە لەسەر بوون بەخۆت و دوورت دەخاتەوە لەو ئامانجە یان نا؟.
دووتا گەرایی یان دوالیزم وەك باسمان کرد خووێکە لە سەرەتای دروســت بوونی مرۆڤەوە تا کۆتایی مرۆڤایەتی لەگەڵیدا دەبێت و دوالیزم لەگەڵ مرۆڤدا دەژیت بەڵام چۆن مامەڵە لەگەڵ دووتایی

خۆماندا بکەین و ڕووە چاکەکەی و ڕووە خراپەکەی دووتایی چۆن بناسینەوە؟
بەشـــێوەیەکی گشـــتی کەمتر هەســـت بە دووتایی خۆمان دەکەین یانیش نامانەوێ هەســـتی پێ بکەین و زیاتر چاومان لەســـەر بەرامبەرە و هەرزوو دەستنیشـانی دەکەین لە کەسـی بەرامبەردا, بەڵام ئەو کاتەی لەخۆماندا دووتایی دەبینین خۆمانی لێ لادەدەین یانیش خۆمانی لێ دەدزینەوە ئەوەشیان خودی دووتایی دەگەیەنێ.
ئەو کاتەی دووتایی بوون مەبەســتی دووڕوویی بەکاردەهێندرێت زیانبەخشە و دەبێتە هەڕەشە لەسەر خوودی کەسایەتی, بۆ نموونە مرۆڤ تا ئەو کاتەی بەرژەوەندییە تایبەت و کەســـییەکانی لە مەترســـیدا نەبێت ڕووە خراپ و شـــەڕانگێزەکەی بەدەر ناخات, هەر کەزانی دیوە ڕاســـتەقینەکەی بەرامبەر کەســـانی تر ئاشـــکرا دەبێت خێرا هەڵپەی وەڵامێکی توند دەکات و خۆی بێبەری دەکات لەهەرچی پەڵەی زبرە و ڕووە شـــاراوەکەی خۆی دێنێتە گۆڕێ و ئەو کاتەشـــــی چاوپۆشـــــی لێ دەکرێت ســـــەری نزم دەکات و سوپاسگوزارە کە هیچی لەسەر نەڵێن.
دووتایی دەکرێت بەکاربێنی لەکارێکی چاك و ورە بەرزکردنەوە و هاندان و دەربڕینی هاوســـۆزی و پاڵپشـــتی کە ئەو شـــێوازەیان کـەمتر دێتـە پێشـــــمـان و دووتـایی بـە دووڕوویی بـەرچـاوترە و خۆپاراستن لێی پێویستییەکی بەبێ شکە,مرۆڤ ئەو کاتەی تووشی خەم و ناخۆشی و ڕووداوێکی ناخۆش دەبێت پێویستی بە دووتاییە لـە بـەرزکردنـەوەی ورەی خۆیـدا, بۆ نموونـە لـەپێنـاوی چۆك دانەدانی خۆتدا دەڵێیت (باشم)! ئەو کاتەی تووشی زیانێکی ماددی دەبیت پێویستە خۆت بە کەسـانی گەورە بەراوردبکەیت کە زیانی زۆر لەوەی تۆ زیاتریان بەرکەوتووە و توانیویانە هەڵسنەوە سەر پێی خۆیان و بگەن بە بەرزتر لەو ئاستەی پێشووتریان لێرەدا هە ردووك زیان نابن بە دووتای تەرازوویەك بەڵام دەبێت ئەوە لە مێشکی خۆتدا دروست بکەیت و وێنای سەرکەوتنی خۆت بکەیت مادام کەســـێك توانی منیش دەتوانم ئەوە بکەم و لە ئاســـتێکی

بەرزتردا کە دەکرێت وەك ســـەرکێشـــی بەکاری بێنیت "ئەگەر کەســیش ســەرکەوتوو نەبووبێت دەتوانم ببم بە یەکەم کەس" بەو پێیەی لە حاڵێکی گونجاودا نەبیت و هانی خۆت بدەیت کە ئێســـتا دۆخێکی گونجاوە لە کۆتاییشــدا ســەرکەوتن ئامانجە و (مەحاڵ) دەبێت بە مەحاڵ, لە حاڵێکی تردا کەســێك کە شــارەزایی پەیدا نە کردووە لە کارێکدا و کارەکانی وەك پێویست بە ڕێوە نابات و کەم و کوڕی تێدا دەبیندرێت ســتایشــکردنی و پاشــان هاندانی دەبێتە هۆی بەرەوپێشـــبردنی لە کارەکەی, منداڵێك کە دواکەوتووە لە فێربوونی نووسین یان خوێندنەوە یان فێربوونی بابەتێك لەبری بە راوردکردنی بە هاوڕێکەی و شــکاندنی, زۆرباشــەی پێدەدەیت و هانی دەدەیت بەرەو باشتر.

لێرەدا دوو شت گرینگە قسەی لەسەر بکرێت یەکەمیان ئەوەیە بە وردی دووتایی بابەتەکان دیاری بکەین و پاشـــان بڕیار لەســـەر چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا بدەین, جیاکاری نێوان هەردوو دووتایی و کێشــانی نەخشــەیەك لە هزری خۆتدا و دیاری کردنی پێوەر بژاردەیەکی دروستە بۆ دیاریکردنی وەڵامێك بۆ پرسیاری (ئایا دووتایی دەبێتە هۆی هەڕەشە لەسەر بوون بەخۆت یان نا؟).

## هەموو کارێك کاردانەوەیەکی هەیە!

هەموو کارێك کاردانەوەی هەیە ئەگەر کارێکت کرد کاردانەوەی نەبوو بزانە کە هیچت نەکردووە لەوانەیە کات و شـــوێن هۆکار بووبن بۆ ئەوەی ئەو کارە کاردانەوەی نەبووبێ پێداچونەوەی پێدا

بکەوە بزانە کە هەڵەیەك لە شـــوێنێك هەیە و بیدۆزەوە یان ئەوەتا بـەشـــێوەیـەکی تر ئـەنجـامی دەدەیت یـان دووبـارەی نـاکـەیتـەوە,



بیرکردنەوە لێی و هەڵسـەنگاندن و لێکدانەوە پاشـان بڕیاردان لە سەری کارە دروستەکەیە.
خودای گەورە لە سوڕەتی (البقرة) دەفەرمویت: (وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِـأَيْـدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَـةِ ۛ وَأَحْسِـنُوا ۛ إِنَّ اللَّهَ يُحِـبُّ الْمُحْسِـنِينَ) (١٩٥) واتا بە دەسـتی خۆتان خۆتان بەرەو هیلاکەت و لەناوچون مەبەن, چاکە بکەن بەڕاسـتی خودا چاکەکارانی خۆشـدەوێت, لەوەوە فێر دەبین گرینگ ئەوە نییە کە کارێك بکەین گرینگ ئەوەیە چی دەکەین و چۆن دەیکەین؟ سـوودی چییە ئەگەر ئەو کارە بکەین ئەگەر نەیکەین کاریگەری چییە؟ ئەمانەو چەندین

پرسـیار و لێکدانەوەی تر پێویسـتە پێش ئەنجامدانی هەر کارێك بیکەین بۆ ئەوەی خۆمان بەرەو هیلاکەت و ناخۆشـی نەبەین بەدەستی خۆمان

(ئیلۆن مەسك) ملیاردێر و داهێنەری سەردەم دەڵێت: (خۆت بنیاد بنێ لە پشوەکاندا, لەبری هەڵهاتن لەو ژیانەی تیایدایت, کاربکە بۆ ئەو ژیانەی دەتەوێت, لە ئێسـتادا بە قورسـی کاربکە بۆ ئەوەی داهاتوو شانازیت پێوە بکات) هەموومان دەبێت دان بە ڕاستییەکدا بنێین کە کەس نایێت بە ئاسـانی دەسـتمان بگرێت و بمانبات بۆ سـەر کارێك چی بیرۆکەی تایبەتی کار هەیە پێمانی بدات بەبێ بەرامبەر مرۆڤی سـەردەم بیرێکی تەسـکی سـەرمایەداری هەیە حەز بە سـەرکەوتن دەکات تەنها بۆخۆی دەیەوێت لەسـەروی هەموو کەسـێك بێت, خۆی لە هەموو کەس بە گەورەتر دەبینێت ئەوە ڕاسـتی و دروسـتی حاڵی زۆربەی مرۆڤەکانە لە ئێسـتادا هەرکەسـەو بۆخۆی هەوڵ دەدات تەنانەت هاوڕێکانیش وەك جاران نەماون مەگەر لە حاڵەتی جیاوازدا نەبێت, بەڵام ئەوە کۆتایی دونیا نییە و دەستپێکێکە بۆ ئەوەی هەوڵبدەیت ببیت بەخۆت (محمد علی کلای) پاڵەوانی یاری بۆکسێن بە ڕەگەز ئەمریکی کە خۆشـەویستییەکی زۆری هەیە لەلایەن موسڵمانانی جیهانەوە وتە یەکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێت: (تەنانەت باشـترینەکانیش سەرەتا بە شارەزاییەکی کەمەوە دەستیان پێکردووە, بۆیە هەرگیز لە هەنگاوی یەکەمت مەترسـە) لەوانەیە شـارەزاییت نەبێت هەڵە بکەیت چی لە کارکردن بێت یان لە قسە کردن یان لە ڕەفتارکردن جیاوازی نییە هەموو ئەوانە پێویستیان بە ئەزموون و بە کات هە یە بۆ ئەوەی لێهاتوو بیت لێیان پێویسـتت بە دەسـتپێکە بۆ ئەوەی بتوانیت ئەوەی لە مێشـکتە بیکەیت بە ڕاسـتی ئەو دەسـتپێکەش بە کارێکی بەرهەمدارەوە دەست پێ دەکات و هەنگاوەکانی سەرەتای هەر دەستپێکێك هەمیشە بچوکن بۆیە زوو بڕیاری کۆتایی هاتنیان مەدە گرینگ نییە لە یەکەم هەنگاو سـەرکەوتوو دەبیت یان نا گرینگ ئەوەیە بەردەوامبیت و کۆڵ نەدەیت تا پێی دەگەیت هەموو

ڕێگایەك تاقی بکەوە بڕوات وابێت کە بەر هەمێکت دەبێت لەو کارە دڵنیابە پێی دەگەیت.

## وا بیربکەرەوە!...

ئەوە لە مێشـــکی خۆتدا جێگیر بکە کە ڕەنگە هەموو دواییەکان هـەموو دواخســـتنـەکـان هـەموو گرینگی پێنـەدانـەکـان ببن بـە

(هەرگیز) ببن بە مەحاڵ ببن بە خەیاڵێکی بەدی نەهاتوو, بۆیە دواخستن بۆ کارەکانت مەکە پێشینان پەندێکی کوردی نایابیان بۆ دواخستنەکان گوتووە کە دەڵێن: (کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەی) چونکە ڕەنگە ئەو دەرفەتەی ئێستا ڕەخساوە بۆ بەیانی بوونی نەمێنێت و ئەستەمبێت بۆیە وا بیربکەرەوە کە لەبری وشەکانی حەزم پێی نییە, توانام نییە, کارێکی بێزارکەرە لەمێشکی خۆتدا ئەوە جێگیر بکە کە (دەبێت) ئەو کارە بکرێت دواخستن بۆ ئەو کارانە نییە کە دەرفەتن, دواخستن بۆ ئەو کارانە نییە کە کاتت هەیە و بەبێ پاساو دوایان دەخەیت تەنها بڵێ دەبێت ئەو کارە بکەم دواخستنی بۆ نییە کەوایە خۆت توشی هیچ پەشیمانییەك ناکەیت,




ئەوەی پێویست بوو بکرێت کردت.
ڕەنگە کارێك بکەیت حەز بە چارەی ئەو کەسانە نەکەیت کە کاریان لەگەڵ دەکەیت لەبەر ئەوە نا کە حەز بەو کارە ناکەیت کارەکە نەکەیت لەبەر ئەوەی دەبێت بیکەیت کارەکە بکە گۆڕینی

بیرۆکەکەت نهێنییەکەیە لەبەر ئەوەی شیرینی خراپە و زیانت پێ دەگەیەنێت شیرینی ناخۆیت نەك لەبەر ئەوەی حەزی پێ ناکەیت, لەبەر ئەوە دەخوێنیت کە فێربیت و بڕوانامەیەك بەدەســت بێنیت نەوەك لەبەر ئەوەی ڕقت لە مامۆستاکەتە وانەکانی ناخوێنیت, تۆ لەبەر هیچ کەســێك کار ناکەیت و ناخوێنیت و هەوڵ نادەیت بۆ ئامانجەکەت لەپێناوی خۆتە و دواجار خۆت دەبیت بەخاوەنی دە ستکەوتی هەوڵەکانت, فەیلەسوف و نوسەری ئەڵمانی و بیرمەندی ســەردەمی مۆدێرن (فریدریك وێلهاڵم نیتچە) دەڵێت( :دونیا ڕەحم بە لاواز ناکات, بەڵام لەبەردەم بەهێزدا کڕنوش دەبات) بۆیە بەهێزبە و بەبێ پســانەوە لە هەوڵەکانت بەردەوامبە ڕۆژێك دێت بە لێوێکی بەخەندە و دڵێکی ئاســودە و مێشــکێکی پڕ ئەزموونەوە ئاوڕێك بۆ دواوە دەدەیتەوە و هەموو ئەو شــتانەی کە قوڕس و ئاڵۆز و بێزارکەر بوون دەبینی کە تێپەڕیون, ئەوکاتە هەســتێکی شانازی و پڕ ئومێد و هیوا سەر هەڵدەداتەوە.

لەســەرەتای هەر تەنگژە و ڕاڕایی و دوودڵیەکەوە بزانە خەریکە گرێیەك دروســت دەبێت لەناوەوەی تۆ ئەگەر خێرا فریا نەکەویت لێت ئاڵۆز دەبێت و دەبێت بە (گرێکوێرە)یەکی ئاڵۆز یان ناکرێتە وە یانیش ئەوەندە خەریکت دەکات کاتێکی زۆرت لێ بەفیڕۆ دەدات و هیلاکت دەکات بەوێنەیەك دوو ئەوەندە کاتت پێویســت بێت تا دەگەڕێیتەوە ئەو دۆخەی ســەرەتا, پێش ئەوەی شــتەکان ئاڵۆزبن فریایان بکەوە و لەکاتی خۆیاندا ئەنجامیان بدە پێش ئە وەی درەنگ بێت, قۆناغێك هەیە بەناوی قۆناغی هاندان کە دەرچەی یەکەمە و تەنها دروســتکردنی ورەیەکە لەناوەوەی تۆدا کە بەبێ دەستپێکردن هیچ گرینگییەکی نامێنێ بۆیە جەخت لەسەر ئەوە بکەوە کە دەســتپێبکەیت دواتر بەردەوامی بەبیرۆکەکانت بدە و لێیان بێزار مەبە چونکە هەنگاوە گرینگ و سەختەکان هەمیشە لەدوای دەستپێکردنەوەن بۆیە خۆت کۆنتڕۆڵبکە و بەردەوامی بەو گەشتە بدە چیتر بڕیار نییە هەنگاوەکانت بۆ دواوەبن دڵنیام لەوەی بەبڕوابەخۆبوون و بەردەوامیدان کارەکانت ئاســانتر دەبن تەنها

ئارام بگره خودا لەگەڵ ئارامگرانه (إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) (البقره ) (١٥٣ )له قورئانی پیرۆزەوه.

## بەدوای خۆتدا بگەڕێ لەبری هەر کەسێك!

دەشـــێ هەندێ جار بیرۆکەیەك یان وەشـــانێکی نوێ لە هزری هەریەکەماندا دروســـت ببێت و بمانەوێ بەرەو ئاڕاســـتەیەك هەنگاو بنێین وەلێ ترس یان دوودڵی و گەڕان بەدوای پاڵپشـتی و بەڵێیەکی کەسانی تردا دوامان بخات کە ئەوەیان خراپی و لاوازی

خۆمانمان پیشـــان دەدات لە ئاســـتی ئەو بڕیارانەی کە داومانە و ناتوانین جێبەجێی بکەین, هەموو شــــت ئامادەیە بیرۆکە و پلان و



دەرفەت و پێویستییەکان تەنها بەدوای هێزێکی دەرەکیدا دەگەڕێین کە پێمان بڵێت بڕۆ, دەست پێبکە, هانت بدا و پێت بڵێت تۆ کارێکی باش دەکەیت و لەوەوە قازانج دەکەیت, بەڵام ئاڵۆزترین وێستگەی ژیان وێستگەی چاوەڕوانییە, دڵنیابە لەوەی ئەگەر بەو جۆرە کارە کانت بەڕێ دەکەیت زۆر درێژە ناکێشـێت و تووشـــی بێ هیوایی دەبیت لەبەر ئەوەی کەمن ئەوانەی بەڵێ بۆ کارێك بکەن کە هێشتا نەکراوە کەمن ئەوانەی خووی هاندانیان لەخۆیاندا چەســـپاندووە نەبادا بگەیت بەو نەگبەتییە و بەدوای بەڵێی هیچ کەســـێکدا مەگەڕێ سەرەتا خۆت بدۆزەوە, ئەوەیە کارە دروستەکە.

هیچ کەس هێندەی خۆت تێناگات لەوەی چیت دەوێت و بەدوای چیدا وێڵی بۆیە ئەو کاتەی خۆتت دۆزیەوە تێدەگەیت ئەو خولانە وە بەدەوری ئەو بڕیارانەی کە داوتە و جێبەجێت نەکردوون لەبەر ئەوەی کەســـت نەدۆزیەوە پێت بڵێت ئەوەیە بڕیار و کارە دروســـتەکەی پێویســـت بوو ئەنجامی بدەیت هۆکارەکەی لە

ونکردنی خۆتـەوە بووە و خۆت لـەواندا بینیوە ئـەوەش هێڵێکی سـوری مەترسـیدارە سـوپاسـگوزاربە ئەگەر لەو کەسـانە نیت بڕیارەکانت خۆت دەیاندەیت و هەر خۆشـت جێبەجێیان دەکەیت خۆت باوەڕ بەخۆت دەهێنیت کە چی بکەیت و چی نەکەیت کام ئـاڕاسـتـە دروسـتـە و ڕێگـا هـەڵـەکـە لـەکوێیـە و لـەکوێی ئـەو هاوکێشەیەدایت ئێستا بیری لێ بکەوە و بڕیاری خۆت بدە بەدوای کێدا دەگەڕێیت؟.

## گەورە بیر بکەرەوە!

دەمارگیری نەتەوەیی و ئۆلی و ڕەگەزپەرسـتی لە خۆتدا بسـڕە خودای گەورە بە شـێوەیەکی جیاواز گەردوون و ئەوەی لەنێو گەردووندا هەیە دروسـت کردووە, مرۆڤەکانیشـی لە ڕەنگی جیاواز و شـێوەی جیاواز دروسـت کردووە لە سـەردەمی جیاواز

ئایین و پەیامبەر و کتێبی ئاسمانی دابەزیون بۆسەر زەوی کە سە رجەم ئەو بیر و باوەڕ و ئایینانە دابەشبوون بەسەر ناوچەی جیاواز لەسەر زەوی هەروەها بە پێی کات و گەشەکردنی مرۆڤ لەڕووی عەقڵیەوە و دواتر دابەشبونیان بۆ ناوچەی جیاواز وای کردووە کە بە جۆرەها زمان قسە بکەن و ڕەنگی جیاواز و ئایینی جیاوازیان هەبێ ئەوەی کە پێویستە لەسەرمان و دەبێ ئەنجامی بدەین ئەوەیە دوورکەوینەوە لە دەمارگیری لەهەر تایبەتمەندییەك کە لە کەسێکی تردا هەیە, کەسێك کە ڕەنگی پێستی سپی یان ڕەش یان سور یان هەر ڕەنگێك بێت ئەوە تایبەتمەندی ئەو کە سەیە جیاوازی نێوان مرۆڤەکانت قبوڵبێت لە کوردەواریدا قسەیە



ك هەیە دەڵێن: (مرۆڤەكان بە جیاوازییەوە جوانن) ئەو جیاوازییە چ لـە ئـایین بێـت یـان ڕەنـگ و زمـانی ئـاخـاوتن یـان جیـاوازی ناوچەیەك بێت لەگەڵ ناوچەیەكی تر.
دەكرێت كەسانێك هەبن كە خاوەن پێداویستی تایبەت بن بەجۆرێك بەشێكی جەستەیان لاواز بێت یان بەشێكی جەستەیان نەبێت یان شێوەیەكی جیاوازیان هەبێت لە ڕووكاری دەرەوەیان, ئەوە مانای ئەوە ناگایەنێ ئەو كەســـە لە كەســـێكی تر كەمترە بەشـــێوەیەك سـەیری مەكە هەست بە جیاوازی بكات لەگەڵ كەسانی تر, مامە ڵەت لەگەڵی با ئاسـایی بێت وەك كەسـانی تر ئەگەر پێویسـتیان بە یارمەتی بوو یارمەتیان بدە, لە شـــوێنێك ئەگەر پێویســـتیان بە یـارمـەتییـەكی تۆ بوو توانـای ئـەوەت هـەبوو دەســـتی یـارمـەتی بگەیەنی و نەتكرد ئەوكات نەبوونت باشـــترە پێداچونەوەیەك بەخۆتدا بكەو نیشانەی پرسیار لەسەر بوونی خۆت دابنێ!
هەمووانت قبوڵ بێت بەو شـــێوەیەی كە هەن ڕێز لە ئایینەكان بگرە و بهێڵە بە پیشـــاندانی ڕەفتارەكانت بیر و باوەڕەكانت بە جوانی لە مێشـــكی بەرامبەردا بچەســـپێنی و نموونەیەكی جوان پیشـان بدەیت, دكتۆر (عەلی شـەریعەتی) نوسـەر و فەیلەسـوفی فارس وتویەتی: (هیچ كات شـتێك لەكەسـێك فێرنەبووم كە لەگەڵم هاوڕا نەبووبێت) بۆیە زۆر پێداگیری مەكە لەگەڵ هیچ كەسێك بۆ ئەوەی وەك تۆ بیر بكاتەوە یان بیركردنەوەكانی بە هەڵە بزانی و پێداگیری بكەیت لەگەڵی بۆ ئەوەی وەك تۆ بیر بكاتەوە لە كاتێك ئەو هەر موكوڕە لەســـەر بیر و بۆچوونەكانی خۆی و تا خۆی بڕوای پێ نەیەت وەك تۆ بیر ناكاتەوە,لەبەر ئەوە ڕێز لە كەســـە كان و بیر و بۆچانەكانیان بگرە وەك ئەوەی كە هەن نەك وەك ئە وەی خۆت دەتەوێت, ئەگەر تۆ ئەوە بكەیت بۆت دەردەكەوێت كە لە ڕوانگەی بەرامبەرەوە باشـــتر قســـەكانت وەردەگیرێ و بە دروســـتی دەزانن چونكە تۆ دژایەتی بیر و باوەڕ و ئایدیای ئەوان ناكەیت تەنها ئەوە ڕوون دەكەیتەوە كە خۆت باوەڕت پێی هەیە ئەمە بۆ كەســـی دووەمیش ڕاســـتە و كاتێك هەوڵی ئەوە دەدەی

قســەی خۆت بکەیت دەبێت ئامادەیی ئەوەشـت تێدابێت کە گوێ لە قسەکانی ئەویش بگریت, وە لە ئایینی ئیسلامیشدا ئەوە بە تەواوی یەکلا کراوەتەوە بەو پێیەی خودای گەورە لە سورەتی )الکافرون) فـەرموویـەتی: (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِين) (٦) واتـا: ئـاییینی خۆتـان بۆخۆتان و ئاییینی خۆم بۆخۆم, باشـــترین کار بۆ ســــەلماندنی دروسـتی قسـە و باوەڕەکانت ئەوەیە تەنها لە قسـەکانت تەسـك نە کرێتەوە بەڵکو بە کردار بیسەلمێنی.

## پەرە بە خووە بەرهەمدارەکان بدە!

خووە بەرهەمدار و بێ بەرهەمەکانی تەمەنی منداڵی:
هەرکەسێك بەپێی ژینگە و دەوروبەری و بەپێی ئەو تەمەنەی کە هەیەتی خوو بە شـــتێکەوە دەگرێت کە بەشـــێك لەوانە پێیان

دەوترێت (خووی بەرهەمدار) و  بەشێکیش (خووی بێ بەرهەم) خووە بـەرهـەمـدارەکـان چین و خووە بێ بـەرهـەمـاکـان چین و چۆنیان جیا بکەینەوە؟



لە تەمەنی منداڵییەوە جۆرێك لە خووی بەرهەمدار هەیە کە ئەگەر شـتێکی کەمیش بێت دەتوانێت دڵخۆشـیت پێ ببەخشـێ بۆ نموونە ئەو یاریانەی کە هەموو هاوڕێیانی لەلای یەك کۆدەکردەوە و جۆرێك لە تەبایی و دڵخۆشـی دەبەخشـی پێمان و تا ئەو سـاتەش ئـاوات بۆ ئـەو ڕۆژانـە دەخوازین جۆرێـك بوون لـە خووی بـەرهـەمـدار کـە ڕۆژانـە دووبـارەمـان دەکردەوە و سـاتـەکـانی منداڵیمان پێ بەڕێ دەکرد, خوێکی تر لەو خووە بەرهەمدارانە کە لە منداڵییەوە زۆرێکمان فێرکرابوین ئەنجامدانی کارەکان بوو لە کاتی خۆی بۆ نموونە ئەرکی قوتابخانە دوا نەخەین بۆ بەیانی و بەسـەرکەوتوویی قۆناغەکانی خوێندنمان دەبڕی ئەو کاتانەی بەو شـێوەیە ئەرکەکانمان بەڕێوە دەبرد, یان یەکێکی تر لەو خووە باو و بەسـوودانەی کە بەرهەمدار بوون یارمەتیدانی دراوسـێکان بوو ئەوکاتانەی پێویسـتیان بە شـتێك بوایە و نەیتوانیبا بچێت خۆی بیکڕێت بە یەکێك لە منداڵەکانی دراوسـێی دەگووت و تا یارمەتی

بدەن لەو کارە, ئەوە خوویێکی باو بوو کە زۆربەمان تاقیمان کردۆتەوە, لەو ساتانە هەم ڕەزامەندی دراوسێکانمان بەدەست دە هێنا هەم بەو کارە تەبایی و لەیەك نزیك بوونەوەی نێوان ئەو دوو دراوســـێیە باشـــتر دەبوو, ئەوە لە بچوکترین ڕوانگەوە بوو بۆ ڕوانینمان بۆ خووە بەرهەمدارەکان کە لە منداڵی ئەنجاممان دەدا.
ئەگەر بێینە سەر باسی خووە بێبەرهەمەکان کە بەشێك لەو خووە بێبەرهەمانە لە ســـەردەمی منداڵی لەوەیە بووبنە ڕەگێك و ئاسەوارییان تا ئێستا بەسەر ژیانمانەوە مابێ بۆیە زۆر گرینگە لە منداڵییەوە پەروەردەیەکی باش بۆ منداڵەکان بکرێت دەربارەی خووە بەرهەمدار و بێبەرهەمەکانیان و ڕایان بێنین لەسەر ئەوەی ئەو دوو خووە لەیەك جیا بکەنەوە چونکە هەروەك ئەو پەندە کوردییەی کە دەڵێت: (خوویێك گرتت بە شـــیری بەری نادەیت بە پیری) هەرچەند ئەم پەندە بۆ کەســـێکی ناهۆشـــیار و ناحاڵی لە خۆی دروستە بەڵام گرینگە لە سەرەتاکانی تەمەنەوە منداڵەکان بە پەروەردەیەکی دروســـت ڕابهێندرێن لەســـەر بەردەوامبوونیان لە سەر خووە بەرهەمدارەکان کە دڵخوازی خۆیانن بۆ ئەوەی بتوانن بەپێی ئەو تەمەنەی کە تێیدان برەو بەو خووە بدەن و تاکێکی بەرهەمداریان لێدەربچێت نەوەك ببن بە بارێکی قورس بەســـەر کۆمەڵگاوە, زۆر لەو قســـانە کە لە منداڵی زۆر بەرگوێمان دە کەوت (تەنانەت ئێســـتاش) ئەوەبوو کە (خوێندن هیچ نییە و بەهیچت ناگەیەنێ, مەخوێنەوە ئەگەرنا مێشـــکت تێك دەچێت, یان گوێ بیستی جوێن و قسەی توند و هەڕەشە ئامێز دەبوین لە دەرە وە....هتد) هەموو ئەوانە بەپێی کات ئەگەر پشـــتگیری دایباب و چواردەور نەبوایە و بمان کردایە بە خوێك لەخۆمان بەهیچ شـێوەیەك نەدەگەشـتین بەو ئاسـتەی کە ئێسـتا تێیداین بەزوویی کاری تێدەکردین و بەرەو ئاقارێکی نادیاری دەبردین, بەڵام زۆرێکیشمان هۆشدارییە پەسندەکەمان سەبارەت بە ژیان کە ئە وەش ڕەگ و ڕیشـەی هەر دەگەڕێتەوە سـەر پەروەردەی خێزان

وای لێکردین بەردەوامی بدەین بەو ئامانجەی کە هەوڵمان بۆی دەدا.

## خووە بەرهەمدار و بێ بەرهەمەکانی تەمەنی گەنجی!

جۆرێکی تر لە خووە پڕ بەرهەمەکان کە لە تەمەنی گەنجییە هەولدانە بۆ دۆزینەوەی بوارێك کە کاری تێدا بکەیت لەوانەیە ئەوە



ماوەیەکی درێژی بوێت و سەرەتا لە کاری بچوك بچوکەوە دەست پێ بکات تا دەگات بەو شوێنەی کە خۆت دەتەوێت بەڵام ئەگەر ئەو خووە نەبێت لە هزری مرۆڤدا ئەوا لە شوێنێکی دیاری کراو و لە ئاستێکی جێگیردا دەمێنێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ بەرەو پێش چونێك لەو کەسەدا ببینرێت دوور نییە کە بگات بە کۆتاییەکانی تەمەنی و هێشتان لەو شوێنەی سەرەتایدا مابێتەوە ئەوەش هۆکارەکەی دەگەڕێتە وە سەر ئەوەی ئەو کەسە حەزی فێرخوازی نەبووە بەجۆرێکی تر دەتوانین بڵێین هەوڵی فێربوونی نەداوە و سەرباری هەموو ئەوانەش لەهەر کارێکدا نوێخوازی پێویستە و بیرکردنەوەکانی مرۆڤێك بۆ مرۆڤێکی تر جیاوازە, بۆیە دەکرێت بەو پێیە تۆش هەوڵی خۆت بدەیت و نوێخوازی لەو پیشەیەدا بکەیت و بەرەو پێشی ببەیت ئەوە خووێکی بەر هەمدارە لە مرۆڤدا کە لە توانای دایە ئەنجامی بدات بەو شێوەیەش ژیانی

مرۆڤ پەرەی سەندووە و گەشەی کردووە تا گەیشتووە بەو سەردەمەی ئێستا.
لە کۆنەوە گوێ بیستی ئەوە بوین گەنجان داینەمۆی گۆڕانکارین و دەستی کار و بەرهەم و پێشکەوتنن و زۆربەی هەرە زۆری داهێنان و گەشەسەندنەکان لە جیهان لەسەر دەستی گەنجان بووە, چونکە تەمەنی گەنجی بریتییە لە تەمەنی هەوڵدان و خۆ ماندوو کردن جیا لەو بیرکردنەوە هەڵانەی کە لای بەشێك لە گەنجان هەیە کە پێچەوانەی ڕای یەکەمە, تەمەنی گەنجی تەمەنی هەست کردنە بە بەرپرسیاریەتی و ڕاڤەکردنی پشت بەخۆ بەستن و هە وڵدانە بۆ دۆزینەوەی دەرگایەك دروست کە لێیەوە ئەو دەرچەیە بدۆزرێتەوە, باشترین خوو ئەوەیە فێرببیت پشت بەخۆت ببەستیت لەپێناوی هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی و پێدانی بەها لەبەرامبەر ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدەیت و دواتر لۆمەی کەس نەکەیت و پێداچونەوە بوخۆتدا بکەیت ئەوە هۆکارێکە بۆ بەهێزبوونی خوودی کەسەکە هەم لە ڕووی دەروونی و هەمیش ئاسودەیی ویژدانەوە, چونکە لای مرۆڤێکی ئاقڵمەند وایە کە گرینگیدان بە پێدانی بەها بە کارەکانی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە خوودی کە سەکە ئانداززیاری بووبێت نەوەك کەسێکی تر کە کاریگەری لە سەر داهاتوی کەسەکە دەبێت, لەوەوە کەسایەتییەکی بەهێز بۆخۆت دروست بکە و ئامادەبە بۆ تەمەنێك کە پێت دەوترێت ( خاوەن ئەزموون) ئەوەیان لە حاڵەتێك کە کەسەکە بڕیاری کارێکی چارەنوسساز بدات کە بە چاکی و خراپییەکانییەوە کاریگەری لەسەر ژیانی خودی کەسەکە دەبێت, بەڵام ئەوەت لەبیربێت کاریگەری کارێك کە بە گروپ و بە کۆمەڵ دەکرێت و کارێك ئەنجام دەدرێت لە ئەنجامی یەکگرتنی کۆمەڵێك لە هاوڕێ, کەسانی خاوەن پلان و بەرنامە, کۆمپانیا و خاوەن پیشەکان, تا دەگات بە یەکگرتنی دەوڵەتەکان ,ئەوکات کاریگەرییەکی بەهێزتر دروست دەکەن و ئەنجامی باش لە کارکردنی بە کۆمەڵەوەیە بە هاوبەشی و کار و پلانی گەورە.

خراپترین خوو لە تەمەنی گەنجی (دەستبەتاڵییە) کە پێویستە هەموو کەسێك خۆی لێ بەدوور بگرێت چونکە جگە لەوەی کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر دەروونی کەسەکە کات کوشتنێکی بێ سوودە لەکاتێکدا دەتوانێت زۆر شت بکات کە ڕەنگە لە تەمەنێکی تر ئەو دەرفەتەی نەبێت و دواکەوتنێکی خێرایە لە کۆمەڵێك لە هەنگاوەکان کە پێویستە ئەنجام بدرێن, زۆربەی خووە بێ بەرهەمەکان ڕەگ و ڕیشەیان دەگەڕێتەوە بۆ دەستبەتاڵی, زۆر شت هەیە دەتوانیت لەو کاتانە سوودی لێوەربگریت و بیکەیت بە خووێکی بەهەمدار لەخۆتدا ئەویش بە دۆزینەوەی خولیایەك دەبێت کە دەبێت لەخۆتدا بیدۆزیتەوە و برەو بەو حەز و خولیایە بدەیت کە هەتە لە بوارێك ئەگەر هیچ خولیایەکیشت نەبێت پێویستە بەدوایدا بگەڕێیت و هەنگاو بە هەنگاو لێیەوە نزیك ببیتەوە تا دەگەیت پێی, ئێستا تۆ مرۆڤێکی زیندووی چونکە بەرهەم دەبەخشیت و جووڵەت هەیە نەوەك ئەو کاتەی دەستبەتاڵییەکەت بە گۆشەگیری پڕبکەیتەوە.

## خووە بەرهەمدار و بێ بەرهەمەکانی تەمەنی پیری!

هەندێجار مرۆڤەکان لەدوای تەمەنێك لە ژیانکردن و بینینی زەمەنێکی دووروودرێژ لە ناسینی کەسانی باش و کەسانی خراپ, ڕووداوی جۆراوجۆر و دەگمەن و تەنانەت بینینی سەختییەکی زۆر بەدرێژایی ژیان و کەوتن و سەرکەوتنی گەورە لە ژیان بەڵام هەموو ئەوانە نابن بە فریادڕەسێك بۆ یارمەتیدانی ئەو کەسە کە وابکەن کەسایەتییەکی بەهێز و کاریگەر لەو کە سەدا دروست بکەن لەپێناوی ژیانێکی باش کە لە سایەیدا بحەسێتەوە.

تەمەنی مرۆڤ وەك پلیکانە وایە هەرچەندەی بەرەو هەڵکشان بڕوات لەگەڵیدا بەرەو پێشچوونی پێویستە ئەگەر وانەکەیت لە



تەمەنێکی گەورەدا وەك هەرزەکارێکی تێنەگەیشتوو دەجوڵێیتەوە قسە دەکەیت و ڕەفتارەکانت کاریگەری خراپ دروست دەکەن لە سەر کەسایەتیت, چونکە گوفتار و ڕەفتار و کردار سیانەی لە پێشینەن کە کاریگەرن لەسەر کەسایەتیت بۆیە ئاگاداریانبە.

مرۆڤ کە چووە تەمەنەوە و تەمەنێکی بەســـەربرد لە ژیان بە بینینی هەموو باشی و خراپییەکانی خۆی و کەسانی دەورووبەری بەو مانایەی هەموو قۆناغەکانی ژیانی بە هەنگاوی جیاواز و جۆراوجۆردا تێپەڕی کرد پێویستە لێیەوە فێری شتێك بووبێت کە جیای بکاتەوە لە کەسێك کە لە تەمەنێکی کەم دایە چونکە ساڵەکانی تەمەن پڕن لە وانەی جیاجیا بۆ هەر مرۆڤێك پێویســـتە لەهەر ساڵکی تەمەنی شتێکی جیاواز فێربووبێت کە ئەو ساڵە جیا بکاتەوە لە ســـاڵەکانی دیکە, بۆ نموونە لەکاتی گەیشـــتن بە وێســـتگەکانی (ماندوو بوون و شـــکســـت و بێ ئومێدیدا) ئەگەر جارێکیان زۆر ماویتەتەوە ئەوکاتە دەبێت فێربووبیت چەندەت زیان لێوەی دیوە لەوەوە و ئەمجارەیان بە ورەی بەرزەوە بەزوویی لەو قۆناغە تێپەڕ دەبیت و هەنگاوێکی باش بەرەو قۆناغێکی باش دەنێیت, ئە وە دەبێ بکرێت بە خوو یەك و ئامۆژگاری کەســـانی تری پێ بکرێت و ورەیان پێ ببەخشـرێتەوە بۆ ئەوەی ئەو خەونە ناخۆشـە چیتر درێژە نەکێشـــێت و کۆتایی پێبێت بۆ ئەوەی هاوکێشـــەی (ماندوو بوون و شـکسـت و بێ ئومێدی) بگۆڕێت بۆ (بەهێزی و سەرکەوتن و پڕ ئومێدی) هەموو ئەوانە پێویستن لەهەر تەمەنێکدا و چ جای ئەو کەســـەی پێویســـتی بە قســـە و ســـتایش و هاندانە ئەرێنییەکانتە و دەیەوێت مشـتێك لە خەرمانی ئەزموونی ژیانتەوە وەرگرێت, مرۆڤیش تا بچێتە ناو تەمەنەوە زیاتر ڕووبەڕووی ئەو کەســـانە دەبێتەوە بەو پێیەی ئەزموونێکی زیاتری لە ژیان هەیە و بگرە وانەی زۆر گەورەی تێدا بینیوە و پێویســـتە لەبری ترسـاندن شـکاندن و بێ ئومێد کردنی جیلەکانی پێشـتر لە ژیان و هەوڵەکانیان کار بکرێت لەسـەر سـتایشـکردن و هاندان و پاڵپشـتی کردنیان, لەوەوە کەســـایەتییەکی بەهێز بۆخۆت و بۆ کەســـی بەرامبەریش بەدەست بێنە و ببە بە فریادڕەس و یارمەتیدەری ئەو کەسـانەی پێویسـتیان بە ئامۆژگاری و قسـەکانتە چونکە قسـەی پڕ بەها ئەو قســـەیە نییە کە دونیا و هەنگاوەکانت لەپێش تاریك دەکا بەڵکو بەهای قســـەیەك لە ڕاســـت و دروســـتی و ئەرێنی بوون و

لۆژیکەوە وەدەست دەخرێت, بۆیە باشترین خووێك کە هەبێت ئەوەیە بۆ هەر ساڵ و ڕووداوێکی جیاواز گۆڕانکاری دروست ببێت لە ڕەفتار و جوڵە و قسەکردن نەبادا ڕەنجت بەخەسارچێت و هیچ بەرەوپێش چونێك لەخۆتدا نەدۆزیتەوە.

## خۆت بە کەس بەراورد مەکە!

لە بەراورددا هەمیشـــە دۆڕان هەیە بۆیە خۆتبە و خۆت بەکەس بەراورد مەکە, زۆر بەمان بیرکردنەوەیەك وای لێ کردوین هە ســت بە کەمیێك لەخۆمان بکەین و زیاترێك لە کەســێکی تر بەدی بکەین یان بە پێچەوانەوەش دروســتە, (خۆبەراوردکردن) هەڵەیە کە پێویســـتە لێی دووربکەوینەوە چونکە بریاری تۆ ئەوەیە ببیت بەخۆت نەوەك کەسێکی تر.
ڕەنگە بیر لەوە بکەیتەوە چۆن بگەیت بە کەســێك کە لە ئاســتێکی بەرزی (ئاییینی, دەســەڵات, پێگەو کەســایەتی, هونەری....هتد) دایە کە بێ ئاگا لەوەی لەوانەیە ئەو کەســـە خاوەنی بەهرەیەکی



خودایی بێت و تۆ ئەو بەهرەیەت نەبێت لەوانەشـــە هەڵێکی بۆ ڕەخسابێ کە بە هەموو تەمەنی خۆت ئەو هەلە نەیەتە بەردەستت یانیش هەوڵ و ماندوو بوونێکی زۆری کردووە تا گەیشــتووە بەو ئاســتە و تۆش ناتەوێ ماندوو ببیت و هەمان کات بشــگەیت بەو

ئاستەی ئەو, جگە لە خەیاڵێکی پڵاو هیچی تر نییە و بۆیە دووربە لە خۆبەراوردکردن و هەوڵدە و ئامانجێك دیاری بکە و ماندوو ببە کاری بۆ بکە تا ئەو ساتەی هەست بە ئارامی دەکەیت, چونکە چێژی ئارامی لە پاشـــگەزنەبوونەوەیە لەو کارانەی کە کردووتن لە پێناوی ئامانجەکەت.

حەز دەکەیت و دەتەوێت و ئاواتی بۆ دەخوازی, کەواتە ســـارد مەبەرەوە و هەوڵی بۆ بدە ڕۆژێك دێت هەموو ئەو حەز و ویست و ئـاواتـانـەت دەبن بـەڕاســـتی, بـەڵام بۆ ئـەوەی نـەدۆڕێیت بـە راوردکاری مەکە تەنها بە عەقڵانی بڕیاربدە و بەقەد بیرۆکەکانت ویســـتەکانت دیاری بکە و لە کات و شـــوێنی گونجاو بەپێی ئەو نەخشـــەیەی لە خەیاڵتە کاری بۆ بکە تۆش دەتوانی دەســـتکەوتێکی مەزن بەدەســـت بێنیت بەڵام ئەوە ئەو کاتە دەبێت کە هەوڵی بۆ بـدەیت,بۆ نموونـە بـاڵـەخـانـەیـەکی بـەرز و جوان دەبینیـت یـان ئۆتۆمبێلێکی جوان و تایبەتمەند دەبینی حەز دەکەیت هیتۆ بن بەڵام دەبێت بیر لەوەش بکەیتەوە بەراوردی خۆت بەکەسێکی تر بریتییە لـە دۆڕانی یـەکێکتـان لـە ئـاســـتی ئـەو بـەراوردە و نـازانی بـە چ شـــێوازێك ئەو موڵکە بەدەســـت هاتووە بۆیە تۆش هەوڵدە بەو بیرکردنەوە و حەز و خولیایەی کە هەتە بگەیت بە شـــوێنێك کە لێی ئـارامبیـت, چونکـە ئـارامی دەروونـت زۆر گرینگترە لـەو خۆبەراوردکاریەی کە کردووتە و لەئاســـتیدا دۆڕاویت تۆش دەتوانیت ببیت بەخۆت گرینگ نییە خاوەنی چیت و موڵکەکانت چەند و چۆنن گرینگ ئەوەیە ئاســـوودەیی دەروونت دۆزیبێتەوە لەو ڕێگەیەوە, دواجار لای خودای گەورە هیچ شـتێك مەحاڵ نییە تەنها بەردەوامبە و خۆت کۆنتڕۆڵ بکە.

## نرخی کات بزانە!

هەمیشـــە ئەوە بەیەکتری دەڵێین کات بەنرخە و نرخی کات بزانە بەڵام زۆربەمان لە ڕۆژەکانماندا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە تەواو بە پێچەوانەی ئەو قســەیە دەکەین کە دەیکەین کات بەبێ نرخ دەبینین و زۆربەی کاتەکانمان بەبەتاڵی بەڕێ دەکەین کە ئێجگار هە ڵەیەکی گەورەیە و لەهەر ســاتێك بە هەوڵ و تێکۆشـــان دەکرێت هەنگاوێك زیاتر نزیك ببینەوە لەو شـــوێنەی کە ئامانجمانە, هەمیشـە بخوێنەوە گوێبگرە تێبگەو هەڵی بسـەنگێنە بەدوای شـتی



بەسوود بگەڕێ بۆ ئەوەی سوود بگەیەنی بەخۆت و دەوروبەرت بـەدوای کـار و بیری بێ ســـوود مـەڕۆ بـا کـاتـەکـانـت نـەکوژن

دەوترێت "کات وەك شمشێر وایە نەیبڕی دەتبڕێت" هەر چرکەیەك کە دەچێتە پێشەوە ساتێك لە تەمەنی ئێمە کورت دەکاتەوە و هەر ڕۆژێکی ژیانمان بەبێ سوود بەڕێ بکەین وەك ئەوە وایە بەرەو دواوە چووبین بۆیە سوود لەهەر ساتێکدا ببینە کە تێیدا دەژیت ئەگەر دەستبەتاڵیش بویت چەند کارێکی گرینگت پێ دەڵێم ئەنجامی بدە کە ڕەنگە هەموو کاتێك دەرفەتی ئەوەت بەدەستەوە نەبێت بۆ ئەوەی ئەنجامی بدەیت, دەتوانیت لەو کاتانەی دەستبەتاڵیت تەسبیحێك بەدەستەوە بگریت و بە هێواشی یادی خودا بکەیت ئەوە هەم سوودێکی نەبڕاوەت پێ دەبەخشێت کە هیچی تێناچێت وە هەم وات لێدەکات هەست بە ئارامی بکەیت لەناخ و دڵ و دەروونت و ڕەزامەندی خودای گەورەش بەدەست بهێنیت و خودای گەورە لە سورەتی )البقرة) بەبەندەکانی دە فەرموێت: (فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ..) (١٥٧) واتا: یادم بکەن یادتان دە کەم, چەندە هیوابەخشە هێندەش ئارامی دەدات بە دڵ و دەروون.
لەو کاتانەی دەست بەتاڵیت دەتوانیت سوود لە پەرەپێدانی توانایەکی خۆت وەربگریت بەوەی زانیاری دەربارەیان کۆبکەیتە وە وەك ئەوەی (بیڵ گەیتس) دەڵێت: (هەموو چرکەیەك کە تۆ بە سەری دەبەیت لەوەی کە هیچ ناکەیت و خۆت فێری هیچ ناکەیت دڵنیابە کەسێکی دیکە خەریکە بە خۆفێرکردن و بەرەو پێش بردنی خودی خۆی) لەو بڕوایەم ئەوە بەس بێت بۆ ئەوەی هانی خۆت بدەیت کە خۆت بەدەستەوە نەدەیت و لە کێبڕکێدابیت لە بەرەو پێشبردنی خۆت ئەو هەستە خراپە ناوەکییەت وەلا بنێیت و ئیتر دان بەوەدا بنێیت ئەگەر ڕاهێنانی بەردەوام نەکەیت و خۆت ماندوو نەکەیت جگە لەوەی بەرەو پێش ناچیت بەرەو دواوەش دەچیت چونکە کات بریتییە لە بەرەو پێشچوونی ژیان ئەگەر لەگەڵ کات و ڕۆژەکان هەنگاو بەرەو پێشەوە نەنێیت چاوەڕوانی ئەوە بکە کە بەرەو دواوە بچیت, چونکە لە دەرئەنجامی ئەوە بووە کە بەدیار ڕۆژە دووبارەکانتەوە دانیشتویت.

هەمیشــە بەردەوامبە لەگەڵ کاروانی کەســانی ســەرکەوتوو وابیر بکەرەوە هەر ڕۆژێك شــتێك فێرنەبووبیت لەهەر بوارێکی ژیانت لەو کاروانە دواکەوتویت و هانی خۆت بدە لەوەی ڕاهێنان بکەیت لەسەر بەرەوپێشبردنی خودی خۆت و بیکە بە خوێکی بەر هەمدار لەخۆتدا بە تێپەڕبوونی کات دەرئەنجامەکانی دەبینیت.

یەکێك لە گرینگترین کارەکان لە ژیانی هەر یەکەمان ئەوەیە کە متمانەت بە کات هەبێت لە ژیانی خۆتدا, چونکە هەموو شتێك لەو کاتەدا دەبێت کە پێویســتە لەوانەیە ئەوە بەپێی ویســتی تۆ نەبێت بەڵام هەموو شــتێکیش لەیەك کاتدا نایەتە بەردەســتت بۆیە بەردەوامبە و بە سـەختی کار بکە و هەوڵ بدە و تێبکۆشـە دەگەیت بەوەی دەتەوێت و ئەو ســەختیەش تێپەڕ دەکەیت بەڵام لەو کاتەدا دەبێت کە کاتی دێت و لە ئەنجامی ئەو هەوڵ و تێکۆشـانەدا دەبێت کە کردووتە نەوەك لەوکاتەی کە دەتەوێت.

## بیرکردنەوەکانت ڕووداوەکان کێش دەکەن!

بیرکردنەوەکانت هەمیشـــە با ئەرێنی بن بۆ ئەوەی هەمیشـــە لە هێمنی دابیت, هەرگیز پێش ڕووداوەکان مەکەوە و بڕیار لەســەر شـــتەکان مەدە چونکە زۆربەی کاتەکان هەر ئەو شـــتەی کە لێی دەترســـین ئەوەمان تووش دەبێت بۆ نموونە کە قوتابییەك بەر لە وەی بچێت بۆ تاقیکردنەوەیەك ئەوە لە مێشـــکی خۆیدا دادەنێت کە خـراپ وەڵام دەداتــەوە ئاماژەیەك بە مێشـــکی دەگەیەنێت کە شـــتەکان کۆتاییان هاتووەو تەواو ئیتر هەر خراپ دەبێت لـــەوەوە دوودڵـــی بـۆ دروست دەبێ و پرسیار و وەڵامـەکـان تێکـەڵ دە کات, یان ئەو ســـاتەی شـۆفێری ئۆتۆمبێلێکی و ئەوەت لە مێشکی خۆتدا داناوە لەو دەرچوونەتدا توشی ڕووداوێك دەبیت دڵـنـیـابـە لــە بـوونــی بچوکترین مــەترســـی کۆنترۆڵ لــەدەســـــت دەدەیت و خۆت تووشی ڕووداوێکی هـاتوچۆ دە کـەیـت چونکـە ئـەوەت بەخۆت گوتووەو چەســپاندووتە لە مێشــکت کە (دەبێت تووشـــی ڕووداوێك ببیت) لەبری ئەوەی هانی خۆت بدەیت و بە متمانە بە خۆبوونەوە بچیتە نێو شـــەقامەکان و بەبێ ترس لەوەی توشـــی هە



رشـتێك ببيت, بۆ ئامانجەكانی ژيانيشـت هەمان شـێوە لەمێشـكی خۆتدا چيت دانابێت هەر توشی ئەوە دەبيت ئەگەر لەمێشكی خۆتدا ئەوەت چەسـپاندبێت كە سـەركەوتوودەبيت دڵنيابە لەوەی سـەركەوتوو دەبيت و ئەگەريش ئەوەت بە مێشكی خۆت گەياندبێت و بڕوات بەوە هێنابێت كە سـەركەوتوونابيت ئەوە ئەو كاتەيە كە بڕيار دەدەيت سـەركەوتوو نەبيت چونكە لە بچوكترين ئاڵنگارييەكان دەسـت و قاچت دەبەسـترێت و ناتوانيت بە بڕوابەخۆبوونەوە بەرەو ئامانجەكەت بڕۆيت ئەگەر پێشـتر هەسـتی متمانە بەخۆبوونت لەلا دروسـت نەبووبێت, ئەوە لەهەموو بوارەكانی ژيانت دروستە بۆ نموونە بڕوای نەخۆش بەوەی زوو چاك دەبێتەوە هێندەی ئەو دەرمانانەی كە بەكاريان دێنێت هيواو وزەی سـەركەوتنی پێ دەبەخشـێت و بڕوای نزاكارێك بەوەی خودا نزاكانی لێوەردەگرێت و بڕوای ئەو كەسـەی كە بەرە و كارێكی نوێ هەنگاو دەنێت بەوەی سەركەوتوو دەبێت و بڕوای فێرخوازێك بەوەی دەتوانێت فێر ببێت لەبری ئەوەی بيانوو بۆخۆی بهێنێتەوە و فێڵ لـەخۆی بكـات بـەو بيرۆكـانـەی كـە لـەمێشـكی خۆيـدا چەسـپاندوونی بەوەی كە (فێرنابێت, لەبيری دەچێتەوە, ناتوانێت بخوێنێت....هتد) و زۆر شتی تر وادەكەن سارد ببيتەوە لە هەنگاونان بەرەو ئەو سـاتەی كە تێدەگەيت هۆكاری سـەركەوتنەكان چەندە وەستاوە لەسەر هەوڵ و تێكۆشان و ماندووبوون ئەوەندەش وەستاوەتە سەر باوەڕ بەخۆبوونت لەو هەنگاوە, بە بيركردنەوەت لە سـەركەوتن (سـەركەوتن بەدەسـت دێنيت) و بەبيركردنەوەت لەوەی توشی شكست دەبيت خۆت( توشی شكست) دەكەيت بۆيە با بيركردنەوەكانت ئەرێنی بن لەپێناوی تۆيێكی سـەركەوتوو و بەهيواو پڕ وزە, لەبری شكست خواردوويەكی بێ هيواو كەم وزە , (بيركردنەوەكانت ڕووداوەكان كێش دەكەن) چەند جارێك ئەو ڕستەيە بخوێنەوە و هەسـتی پێ بكە و بيری لێ بكەرەوە لەژيانی خۆتدا كاری پێبكە زۆر بە ئاسانی دەرئەنجامەكانی دەبينيت.

**لوتبەرز مەبە!**

لوتبەرزەکان کەس لەخۆیان بە باشـتر, زیرەکتر, لێهاتوتر, نایابتر نازانن هەمیشـــە خۆیان پێ لە هەموو کەس پێ نایابترە وا خۆیان دەردەخەن و هەڵسـوکەوت دەکەن کە لە سـەروی هەموو کەسـە وەن, یەکەم تاوان کە لە قوڕئانی پیرۆزدا باسـی لێوە کراوە ( کیبر) خۆ بە گەورەزانی و ڕوح زلی و لوتبەرزییە ئەو کاتەی کە خودای گەورە فەرمانی بە ئیبلیس کرد کڕنوش بۆ ئادەم بەرێت وتی نەخێر کڕنوشـی بۆ نابەم چونکە من لە ئاگر دروسـت کراوم و ئادەم لە قوڕ دروست کراوە.
زۆرجار لوتبەرزەکان فیز بە شتگەلێکەوە لێدەدەن کە هی خۆشیان نییە وەك ئەوە حەزرەتی (مەحوی) شـــاعیری گەورەی کورد دە فەرمویێت: (فەزیلەی ئەسـڵ و فەسـڵ ئینسـانی پێ نابێ بە خاوەن فەزڵ, کە تۆ کۆسـەی, بە تۆ چی مامە ڕیشـی باب و باپیرت) بە شـێوەیەك لوتبەرز بوون وادەزانن چەقی گەردوونن، وادەزانن باڵیان هەیە و دەتوانن بفڕن هەردەم لە بەرزیەوە سـەیری خەڵکی دەکـەن و خـەڵکی بـە بچوکی دەبینن, لـە ڕاسـتیدا هـەرچـەند بەردەوامبن لەسـەر ئەو خووە بەد و ناشـیرنەیان لەلای خەڵکی بە بچوکتر و کەم بایەختر سـەیر دەکرێن و هەر بەوشـێوەیەش



دەبیندرێن, چینییەکان وتەیەکی جوانیان هەیە دەڵێن: "ســـادەیی دەستوری ئەتەکێتە, سادەکان هەرگیز دووڕوویی ناکەن" (ماهاتما گاندی) هەرچەند لە خێزانێکی پارێزەر کە باکگڕاوندێکی سیاسی دوورودرێژیان هەیە لە دایك بووە و کەســـایەتییەکی ســـیاســـی و ڕێبەری ڕۆحی هیندۆســـەکان و هێمای ئازادی وڵاتی هیندســـتانە, بەڵام ئەو کاتەی لە خوێندنی پارێزەری لە لەندەنەوە گەڕایەوە بۆ هیندســـتان هەروەك خەڵکی دەژیا و لەناو خەڵکیەوە ژیانی بەســـەر دەبرد و کار و چالاکییەکانی دەســـت پێ کرد تا بەریتانییەکانی دە رکرد و هیندســـتانی ڕزگارکرد لە دەســـتیان هەر لەنێو خەڵکی و لەگەڵیان دەژیا ئەوەش هۆکارێك بوو بۆ بە کاریزما بوونی و ســـە رکەوتنی بەسەر داگیرکەرانی وڵاتدا.

لە فیلمی (Bala) کە فیلمێکی هیندییە هەردووك ئەکتەری هیندی (ئەیوشـــمان کورانا) کە ڕۆڵی (بالا) دەبینێ و (بهومی پیدناکار) ڕۆڵی (کوبجا) دەبینێت بەیەکەوەن لە قوتابخانە, لە ســـەرەتاکانی تەمەنی بالا بە قژە خاو و درێژەکەیەوە دەنازێت و گاڵتە بە کوبجا دەکات کە کچە هاوڕێیەکی قوتابخانەیەتی بەوەی کەوا ڕەنگی پێستی ڕەشە هەرچەند کوبجای خۆشـی دەوێ بەڵام گاڵتەی پێ دە کات و پێی دەڵێت: (کوبجا ڕەش) بەڵام لە دوای چەند ســـاڵێك و دەگاتە تەمەنێکی گەنج هێواش هێواش خۆی قژی هەڵدەوەرێت و کەچەڵ دەبێت تاوای لێدێت شـــەرم لە کەچەڵ بوونەکەی دەکات و کڵاو لەسەردەکات بۆ شاردنەوەی ئەو قژە کەمەی کە بەسەریەوە ماوە.

لەو کاتانە بۆ کۆمپانیایەکی جوانکاری کار دەکات, ڕۆژێکیان ســـیمینارێك ڕێك دەخات بۆ ناســـاندنی کرێمێکی ســـپی کردنەوەی پێســـت لەو ســـیمینارەش کوبجا ئامادە دەبێت, کوبجا کە بالا دەبینێ وەســـفی کرێمەکە دەکات وەك تۆڵە کردنەوەیەك پێی دەڵێت کڵاوە کەت لابە کێشەت چییە کۆمپانیاکەت هیچ بەرهەمێکی دروست نە کردووە بۆ کەچەڵی؟ ئەوە دۆخێکی شەرمەزاری بۆ بالا دروست دەکات لە بەردەم ئامادەبوان و هەست بە شـەرمێکی زۆر دەکات!

بۆیە لەوەوە فێربە هەر شتێك كە شانازی پێوە دەكەیت كاتییە تەنها كار و كردەوە و كەسایەتیت لەدوای خۆتەوەش ڕۆڵی خۆیان لە بە رزكردنەوەی ناو و ناوبانگت دەبینن.
(جۆن سی ماكسوێڵ) زۆر جوان دەیپێكت كە دەڵێت: "لەخۆبایی و لوتبەرزی شكست بەدوای خۆیدا دێنێت" ئەوە وەك وانەیەك وایە بۆ هەمووومان كە چی بكەین هەر ئەوەمان دێتەوەڕێ باشترین كار كە بیكەین بۆ هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ بەرامبەر ئەوەیە كە پێش ئەوەی قسەیەك یان ڕەفتارێك بكەین پێویستە خۆمان لە جێگای ئەو دابنێین بۆ ئەوەی ئازاری هەستەكانی كەسی بەرامبەر نەدەین پێش هەموو شت ئاگاداری یەكە بە یەكەی وشەكانت بە چونكە هەندێك وشە هەن بێ ئەوەی ئاگاداریان بین شوێنەواری قوڵ لەسەر دڵی مرۆڤ بەجێ دێڵن (پیرەمێرد) شاعیری گەورەی كورد لە كۆپلە شیعرێكی دەڵێت: (هێندە بەرز مەفڕە بڵێن بێباكە ,دیارە بێباكی هەر بۆ خودا چاكە).
یەكێك لە یاساكانی شكۆمەندی بۆ مرۆڤ ئەوەیە كە خۆت بەسەر كەس نەسەپێنی و كەسیش بەسەر خۆت نەسەپێنی, چۆن سەیری خەڵكی بكەیت دڵنیابە لەوەی بەو شێوەیە سەیر دەكرێیەوە بە بچوكی و بە كەمی خەڵك ببینی بە بچوكی و كەمی سەیر دەكرێیت (ئیمامی عەلی-ڕەزای خوای لێبێت) چوارەم خولەفای ڕاشدین دەفەرموێت: (مرۆڤی لوتبەرز وەك ئەو مرۆڤە وایە لە سەر شاخێك بێت مرۆڤەكانی خوارەوە بە بچوكی دەبینێت, بێ خەبەرە لەوەی كە لە خوارەوەش بە بچوكی ئەو دەبینن).

## ساڵێكی نوێ یان تۆیەكی نوێ؟

ئەو کاتە ســـاڵێکی نوێیە کە هەنگاوێك بەرەو پێشـــەوە دەڕۆیت هـەوڵێکی تر بۆ ئـامـانجـەکـانـت دەدەیـت هیوایـەك بـە کـەســـێك دەبەخشیت.
دەوترێت ساڵەکانی تەمەن تەنها ژمارەن بەڵام لە ڕاستیدا زیاترن لە ژمارە!
زیـادبوونـی ژمـارەیـەك بریتییە لـە کـەمبوونـەوەیەك لـە تـەمـەنت, بریتییە لە بەدەستهێنانی هەلێکی تر بۆ ژیان لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە دەتوانیت ئەو هەلە بقۆزیتەوە یان نا؟
لەبەر ئەوەی کات بۆکەس ناوەســـتێت بەردەوامە لەبەرەوپێش چوون و هەمیشـــە بۆ پێش دەڕوات, بۆیە زاڵبە و هەنگاو بەرەو




پێشـــەوە بنێ لە دواوە دەمێنیتەوە و بەجێ دەمێنیت یان بەرەو پێش دەڕۆیت و بەردەوام دەبیت بڕیار لەدەســـتی خۆتە و بڕیار بدە ئەوەی کـە کردووتـە دووبـارەی دەکـەیتـەوە یـانیش دەیکـەیـت بـە ئەزموون و لێیەوە فێربویت و داهێنانی تێدا دەکەیت.

هەرگیز هەڵە و شكستەكانت لە ئێستادا یان ڕابردوو یان ئەوەی لە داهاتوو توشی دەبیت نابنە پێوەر لەسەر تۆ كە كەسێكی بەهێزیت یان لاواز, ئەو كاتە بزانە كەسێكی لاوازیت كە هەڵە و شكستەكانت دووبارە كردەوە كە ئەو خراپیەی لەخۆتدا هەبووە چاكت نەكردووە, هەڵە هەڵە هەڵە دووبارەت كردەوە دەبێت چاوەڕێی شكستیش بیت لەبیریشت بێت ئەگەر بەرەو سەركەوتن چویت دەبێت خۆت ئامادەكردبێت بۆ شكستیش بەڵام گرینگی شكست لێرەدا ئەوەیە كە لێیەوە فێر بووبیت و كردبێتت بە پەند بۆخۆت.

مەرج نییە هیچ شتێك مەحاڵ بێت لەگەڵ سێ هاوڕێی بێ پلانت كاتەكانت بەسەردەبەیت بێ گومانبە لەوەی زۆر ناباك چوارەمیان خۆتی, بۆیە وریابە و ژیربە لە هەڵبژاردنی ئەو كەسەی كاتی خۆتی پێ دەبەخشیت.

بۆ ئەوەی تۆیەكی نوێ ببینین پرسیار لەخۆت بكە و بەخۆداچونەوەیەك بكە هەر ئەو كەسە دەبیت كە بویت یان بەرەو پێش هەنگاو دەنێیت و لەو چەقبەستوییەت دەردەچیت.

ئەمساڵت چۆن بەڕێ كردووە؟

بەچی خەریك بویت و چیت كرد؟

سوودت بۆخۆت و دەوروبەر وكۆمەڵگا هەبوو یان بویت بە بارگرانی بەسەر شانی كەسانی ترەوە؟, لەكاتێكدا توانای هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتیت هەیە و پێویستت بە یارمەتی كەس نییە.

چی فێربویت لە ماوەی یەك ساڵی ڕابردووت؟

ڕۆژەكانت چۆن بەڕێ دەكەیت و بۆ بەو شێوەیە بڕوات؟

ئایا وا باشترە یان گۆڕانكاری لەخۆتدا بكەیت؟

ئێستا لەكوێی گۆشە و هاوكێشەكەدایت و دەتەوێت بگەیت بە كوێ؟

دەتەوێت هەروا بەردوامبیت؟

لەخۆشت ڕازیت؟

ئەمانەو چەندین پرســـیاری تر لەخۆت بکە بۆ ئەوەی درك بەوە بکەیت و بە ئاگا بێیتەوە, ئەگەر لەهەمان گۆشـــە دەخولێیتەوە ڕێگاکەت بگۆڕە ئەو شوێنەی قەتیس بویت لێی هەڵەیە شۆڕش لە خۆتدا بکە هاوڕێ ببە بەخۆت!
ئەگەر وەڵامەکانت ئەرێنین بەردەوامی پێ بدە ڕۆژەکانی وەك یەك نەبن و بەرەو پێشـــەوە بڕۆ ئاســـتەنگەکان دەبڕیت و فێردەبیت لەکۆتاییدا سەرکەوتوویت.
بزانە ئەو کاتە ساڵێکی نوێیە بۆت کە بڕیاری شتگەلێکت بۆخۆتدا کە هەم دڵ و هەم گیان و مێشـــکت پێی ئاســـوودەبوون, ئەو کاتە ســـاڵێکی نوێیە کە هەنگاوێك بەرەو پێشـــەوە دەڕۆیت و ئارامی بۆ بوونی خۆت دەدۆزیتەوە, بە گرینگی مەزانە ڕۆژێك پێش سـەری ساڵ یان ڕۆژی دوای سەری ساڵ یانیش لە ناوەڕاستی ساڵەکەیا هەنگاوت نا, ئەوکاتە تۆیەکی نوێ بوونی دەبێت کە بەردەوامی بە خاڵە ئەرێنییەکانت بدەیت و بەرەو پێشیان ببەیت و خاڵە نەرێنی و لاوازەکانت بناسـی و بیقۆزیتەوە لەبەرژەوەندی خۆت و هەوڵـی چاکسازکردنیان بۆ بدەیت دڵنیابە ساڵێکی نوێ ئەو کاتە دەست پێدەکات بۆتۆ.
هەرگیز با ســـاڵێکت لە تەمەن نەڕوات کە ســـوودت بۆخۆت و دەوروبەریشـــت نەبووە, هەرگیز ئەو وزەیەی ئێســـتا هەتە بە خەمخواردن بۆ دوێنێ بە فیڕۆی مەدە و واز لەو وەهم و ساوێرانە بێنە کە دانیشـــتویت بە دیاریانەوە کار بۆ ئامانجێك بکە و بەدی بهێنە, وەچەرخانێك لە ژیانی خۆتدا دروست بکە بەو شێوەیەی کە خۆت دەتەوێت و هەڵسەنگاندنت بۆی کردووە.

## قسەی خەڵك!

دروسته ئەگەر بڵێین قسەی خەڵك ناوەستێت!؟
(جۆرج یوسـف) گۆرانیبێژی عەرەب و وڵاتی سـوریا دەڵێت: (قسەی خەڵك نە سەرەتای هەیە و نە کۆتایی) ئەوە بووە بە خوێك مرۆڤی ئێستا خوی پێوە گرتووە قسە لەسەر هەموو بابەتێك دەکات خۆی دەخزێنێتە نێو هەموو بابەتێکەوە بێ ئەوەی شـارەزایی لێی هەبێت قسە لەسەر بابەتی پزیشکی, سیاسی, ئایینی, زانستی...هتد دەکات ئیتر چۆن نایێتە نێو ژیانی تۆوە چۆن قسەت لەسەر ناکات, مرۆڤ سەردەمانێك بوو بۆخۆی دەژیا خەمی خۆی و ژیانی خۆی و خێزانەکەی بوو بیری لای بژێوی ژیان و بەخێوکردنی ماڵ و منداڵەکەی بوو, بەڵام ئێسـتا زۆربەی مرۆڤەکان چێژ لەوە دەبینن




خۆیان هەڵبقوڕتێننە نێو ژیانی تاکە کەسـی و تەنانەت دەگاتە ئاسـتێك ئەگەر سـنورێك بۆ ئەو قسـانە دانەندرێت کاریگەری خراپی لەسەر ژیانمان دەبێت, ئەوانە هەموویان ئاساییـن سروشتی مرۆڤ وایە بەپێی سـەردەم و بارودۆخەکان دەگۆڕێن لە سـەردەمانی زوو لە گوندێك ناوچەیەك لە شـوێنێك ئەگەر کەسێك خاوەن (ئۆتۆمبێلێك) بوایە هەموو خەڵکی دڵیان پێی خۆش دەبوو چونکە هاتوچۆی شاری دەکرد و سوودی بۆ خۆی و بۆ خەڵکیش

دەبوو, هەمووان لە ماڵێك كۆدەبوونەوە كە تەلەفزیۆنێكی بچوكی ڕەش و سپی لێیە, شەوانی درێژی زستان بەدەم یاری كردن و شەوچەرەوە تا درەنگانێكی شەو دەمانەوە هەمووان سادە بوون و بەیەكەوە دەژیان و دڵخۆش دەبوون, سەردەمی ئێستا زۆر جیاوازە و جیهانی تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان و میدیا و ئینتەرنێت و جیهانگیری و ململانێی كەسییە زۆرینەی خەڵكی بەدوای كەموكوڕیەكانت دەگەڕێن و خاڵە لاوازەكانت دەپێكن بۆیە لاواز دەرمەكەوە لە ناخەوە بەهێزبە ڕووكاری دەرەوەت بەهێز پیشان بدە بۆ ئەوەی هێزی خۆت پیشانی ئەو كەسانە بدەیت كە بەدوای لاوازیتدا دەگەڕێن, دڵنیابە لەوەی هەرگیز ناتوانین لە جیهانی دەرەوە ئارامی بەدەست بهێنین پێش ئەوەی لە ناخ و دەروونی خۆمانەوە دەست پێ نەكەین و ئارامی لە ناخەوە بۆخۆمان دروست نەكەین.

شاعیری گەورەی كورد پیرەمێرد لە شیعرێكدا دەڵێت: (لەڕووی جیهاندا تۆ وەرە پاكبە, ئەوسا لە وتەی خەڵكی بێباكبە) گرینگ نییە كە قسەگەلێكی زۆر دەكرێن لە دواتەوە چونكە ئەو خەڵكە دادوەر نیین بەسەرتەوە ناتوانن لێپرسینەوەت لێبكەن لەسەر ئەوەی كە چی دەكەیت و چی ناكەیت بەرپرسیار نیت لەبەردەم خەڵكی كە دەبێ چی بكەیت تا دڵی ئەوان ڕازی بكەیت تەنها ئەوە بكە كە خۆت باوەڕت پێی هەیە بەڵام لە چوارچێوەی زیان نەگەیاندن بەكەس, با خۆشیەكانت دەستكەوتەكانت سەركەوتنەكانت لەسەر حسابی كەس نەبێت (چارلز بۆكۆفسكی) دەڵێت: (وەك خۆت بژی, خوداوەند تۆی وەك هیچ كەسێكی تر نەخوڵقاندووە تا ناچاربیت لەبەر ڕازیكردنی دڵی خەڵك وەك ئەوان بژیت).

مرۆڤ تەنها لەبەردەم خودای گەورەدا بەرپرسیارە لەبەردەم خودایەك كە نە دەخەوێت نە برسی دەبێت نە پێویستی بەكەسمانە ئاگای لە حاڵی یەكە بە یەكەمانە دەزانێت كە چیمان دەوێت و چی دەكەین خودایەك كە ئاگای لە بەربونەوەی گەڵای دارێكە چۆن

ئاگای لە نییەت پاکی مرۆڤێك نییە بێگومان ئاگای لێیە, نزا بکە تەنانەت قەدەری خوای گەورەش بە نزاکردن دەگۆڕێت.

**لەپاڵ لۆژیکدا ئەزموون خێراترین ڕێگایە بۆ فێربوون!**

مرۆڤ ئەوەتەی لە دایك دەبێت هۆشـگیری دەخاتە سـەر فێربوون و لە دووبارەکردنەوەی شـتەکانەوە فێری قسـەکردن و ڕۆیشـتن و جوڵە جیاوازەکان و هەر شـتێکی تر کە دەیبینێت دووبارەی دەکاتە وە چونکـە نـازانێ و شـــــارەزا نییـە بۆیـە وەك چۆن بۆ منـداڵێك فێرکردنی دەسـت لێ نەدانی لە (زۆپا و ئاگر و چەقۆ...هتد) هەر شـــتێك کە زیانی پێ دەگەیەنێت گرینگە و لێیانەوە فێر دەبێت یان ئەوەتا جارێك و دووانیش لەوەیە نزیکیان ببێتەوە و ئەزموونی بکات لەبەر ئەوەی جارێ دڵنیا نییە لەوەی بۆچی پێی دەڵێن وامە



کە و (بقەیە) هەر کە زیانەکەی هەســت پێکرد ئیدی لە دوورەوە ترسی لا دروست دەبێت و نزیکی نابێتەوە.
دەمەوێ پێت بڵێم (لەپاڵ لۆژیکدا ئەزموون خێراترین ڕێگایە بۆ فێربوون) هەر شتێك کە عەقڵ و لۆژیك قەبوڵی نەکرد پێویست بە ئـەزموونکردنیـان نـاکـات بۆ منداڵێك لۆژیك بـەهـایـەکی نییـە کـە درکی پێ ناکات و ئەزموون داخاتەگەڕ و لە تاقیکردنەوەی هەر

شـــتێکەوە فێردەبێت ئەگەر بە زیانێکیش دەســـتپێبکات و کۆتایی پێبێت, بەڵام بۆ کەسـێك کە هەسـت بە خۆی و بوونی خۆی بکات و توانای بەکارهێنانی عەقڵی هەبێت بەتەنها ئەزموون نایگەیەنێتە کۆتاییەکی باش چونکە لەوانەیە زۆر شـــت تاقی بکاتەوە کە ببێتە مەترســـی بۆســـەر ژیان و ماڵ و تەنانەت کەســـایەتی بۆیە بەکارهێنانی لۆژیك و عەقڵ لەپێش ئەزموونکردنەوە ئاســـۆیەکی ڕوونترت پێ دەبەخشێت.

ئەو کاتەی دەتەوێت شـــتێکی جیاواز و نوێ تاقی بکەیتەوە ئەو کـاتـەی بـەرەو پیلی خۆزگـە و حـەز و خولیـاکـانـت دەڕۆیـت هـە ڵسـەنگاندنێکی لۆژیکی بکە بۆ ئەو ڕێگایە کە چیت پێ دەبەخشێت و چیت لێ وەردەگرێتەوە پاشان بە هەنگاوی سەرەتایی دەستپێبکە و بەرنامەڕێژی بۆ بکە, دەمەوێ نموونە بە کارێك بهێنمەوە کە دە تەوێ دەســـتی پێ بکەیت دڵنیابە لەوەی بە چەند دانە ڕۆژ ێك ناتوانی هەموو شتێك فێرببیت و سەرکەوتووبیت, بۆیە ئەوەبکە بە پێوەرێك و پێش ئەوەی ســـارد ببیتەوە لەو کارەی کە دەتەوێ دەســـتی پێ بکەیت یانیش دەســـتت پێ کردووە بۆ فێربوونی هەر کـارێکی نوێ کۆکردنـەوەی زانیـاری لـەســـەر کـارەکـە بـەهـەر ڕێگایەکی بەردەســـت پاشـــان ئەزموونکردنی خێراییەکی باشـــت پیشـان دەدات لە بەرەو پێش چوون لەو کارە و بیرت بێت (لەهەر کارێکی نوێدا لایەنی کەم ســـێ مانگت پێویســـتە بۆ فێربوونی) ( محمد علی کلای) یاریزانی بەناوبانگی یاری بۆکسێن و بەڕەگەز, ئەمریکی دەڵێت: (ڕقم لە چرکە بەچرکەی کاتی مەشق و ڕاهێنان دەبووەوە, بەڵام بەخۆمم ووت ئێســـتا هەوڵبدە و ماندووببە تاوەکو لە دا هاتوودا بە ســـەربەرزی و پاڵەوانی بژیت) بۆیە هەرزوو چۆك دامەدە و بیر و هۆشت لای کارەکەت بێت هیچ شتێکی تر نا تەنها ئەوەبکە چونکە ڕۆژێك دێت ئەو شتانەی ئێستا فێری دەبیت کەســـانێکی تر لەتۆوە فێر دەبن و دەبیت بە ســـەرچاوەیەك بۆ زانیارییەکانیان ئەوکاتە تۆ هەمان ئەو کەســـەی ئێســتایت بەڵام بە هەگبەیەکی پڕەوە سەرکردایەتی دەکەیت.

بەدوای زانیاریدا بگەڕێ و ئاسانکاری بۆخۆت بکە لە ئەنجامدانی ئەو کارەی کە مەبەستتە, نوسینی تێبینی (NOTE) لە هەر بابەتێکی سەرنج ڕاکێشدا یانیش گرینگ بۆ ئەوەی بەسەریدا تێنە پەڕیت و بیرت نەچێت کارێکی پێویستە پاشان لەو کاتەی کە پێت باشە بچۆرەوە سەر تێبینییەکەت و کاری لەسەر بکە لەوەوە ئەنجامی باش وەدەست دەخەیت, دڵنیابە ئەگەر ئەو کارەی لەپێناویدا دەجەنگیت و بوو بە ڕێگایەکی سەخت و ماندوو بوویت لەگەڵی کۆتاییەکی قەشەنگ و جوانی هەیە چونکە ڕێگا ڕاستەکان هەرگیز شۆفێری لێهاتوو دروست ناکەن لە چاڵ و چۆڵییەکانی ژیان مەترسە و هەوڵبدە بەسەریاندا زاڵبیت بیرت بێت ئەو کاتە کاپتنێکی باشیت بەسەر گەرداوی گەورەدا زاڵ بوو بیت.

**نواندن بۆ کەسایەتی خۆت مەکە چۆنی هەروابە!**

چەندە سـەختە کە ڕۆژگارێکی دووڕوودرێژمان لەگەڵ کەسـانێك ڕابردووە و هەمیشـە خەریکی مەرایی کردن بووە بۆمان بەڵام لە ناکاوێك بەرگی ڕاسـتەقینەی ئەو کەسـەمان بۆ دەردەکەوێت با هەر یەکێکمان خۆمان لەجێی ئەو کەسـە دابنێین کە بەو پەڕی نیاز پاکیەوە سەیرمان دەکات لەپای چی ماسکێکی درۆینە بپۆشین با وەك ئەوەی هەین خۆمان دەرخەین شـانازی بکە هەرچۆنێکبی بەڵام ماسـکی درۆینە مەخە سـەر روخسـارت, خودای گەورە لە سـوڕەتی (التوبـة) دەربـارەی دووڕووەکـان دەفـەرموێت: (إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِـقُون) (٦٧ )واتا: بەدڵنیایەوە دووڕووان گەلێکی دەرچوون لە باوەڕهێنان بەخوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی (ﷺ), جگە لەوەی خاڵێکی نەرێنی و خراپە لە دینی ئیسـلامدا و




کاریگەری لەسەر ئیمانت دروست دەکات هاوکات ئەو سیفەتانەی وەك درۆکردن و خیانەتکردن لە ئەمانەت و پەیمان شـکاندن و لادان لە حەق ناتکەن بە کەسـێکی بەهێز هەردەم وەك لاوازێك بەدەر دەکەویت ترسـت هەیە لەوەی ڕووخسـارە ڕاسـتەقینەکەت بەدیار بکەوێت ئاسـاییە ئەگەر ببینین کەسێك لە ناخەوە هەستێکی شـەڕەنگێزی هەیە و هەمیشـە بەدوای نانەوەی ئاژاوەیە خەڵکی دە شـکێنێتەوە و چێژ لە نارەحەتکردنی کەسـانی تر دەبینێت ئەوە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە کارێکی باش دەکات, نەخێر بەڵام کارە

کتەری ناخی وەك خۆی پیشـــان دەدات چۆن بیر دەکاتەوە هەروا دەردەکەوێت بیرت نەچێت هەمووان وەك یەك نابن, ئەوە زۆر لە وە باشـترە کە لە ناوەوە شـەڕەنگێز و دوژمنکاربی بەدەوروبەر و خۆت وەك کەسێکی باش و هاوڕێ دەرخەی نواندن بۆ کەسایەتیت بکەیت! (عمر ال عوضــــە) نوســـەری گەنجی عەرەب و وڵاتی ســـعودییە دەڵێت: (چ ســـەیرە ئەو کەســـانەی ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆشــمان ویســتون چۆن دڵیان دێت دڵمان بشـــکێنن) دووڕوویی کارێکی بەدە و خۆتی لێ بەدوور بگرە با قبوڵکراوی نێو خەڵك بیت و دڵی کەســـت لێ نەڕەنجێ بەســـەر خۆتدا زاڵبە و ڕەفتار و گوفتارت ڕەنگدانەوەی ناخی خۆتبێ هەرچەند خراپبیت لە ناخە وە, بە خراپی خۆت دەرخە لەوە باشـــترە ببیت بە ئەکتەرێکی ڕۆبۆتی و خۆت پێش هەموو کەس لە خشـــتە ببەیت, خراپەیەکی گەورە بەرامبەر بە کەسـێك بیکەیت ئەوەیە فێڵ لە کەسـێك بکەیت کە متمانەی پێت کردووە, ڕۆژانێك جێگای باوەڕی ئەو بویت بەڵام کە فێڵت لێی کرد خیانەتت لەو پەیوەندییە کردووە.

(ڤیکتۆر هۆگۆ) نوســـــەر و ڕۆمـاننوس و چـالاکڤـان لـە پـەیڤێکی جواندا بە کورتی و پوختی دەڵێت: (ئەوەی دەیڵێی بیکە و ئەوەشـی دەیکەیت بیڵێ) چیت لە ناخە هەر ئەوەبە خۆت و کەســــایەتی خۆتت بەو شـــێوەیە قبوڵ بێت کە دەتەوێ و بڕیارت بۆی داوە و دەســـتبەرداری ئەو فرەڕوییە ببە, زۆرجار دەبینین کەســـانێك لە چواردەورمان هەن تا ئەوکاتەی ڕوخساری ڕاستەقینەیان بۆمان دەردەکەوێت هەســـتیان پێ ناکەین گەورەترین بیانومان ئەوەیە وانەبوون و گۆڕان ئەوەی پێویســـتە دانی پێدا بنێین و ڕاســـتییەکە ئەوەیە کە ســـروشـــتی ڕاســـتەقینەی خۆیان لەو کاتە دەرکەوتووە ئەگەر تەمەنێکیش بێت ناســـیبێتمان, شــاعیر و نوســـەر و گەورە شـانۆنوسی بەریتانی (شکسپیر) دەڵێت: (خودا ڕوخسارێکی بەتۆ داوە و تۆش چەند ڕوخســــارێکی دیکەت لێی دروســـت کردووە) ئەوە حەقیقەتی تاڵی مرۆڤایەتییە لە ســـــەردەمە جیاوازەکانەوە هەبووە و تا ئێســــتاش بوونی هەیە, زۆر ئەســـتەم ڕوخســــاری

ڕاستەقینەی مرۆڤکان دەبیندرێت زۆرینەیان ماسکێك بەسەر دەموچاویانەوەیە و لە ناخەوە کەسێکی ترن ئەوەی حەقیقەتی ڕاستەقینەی کەسایەتییە لە ناخی مرۆڤەوەیە لە دڵەوە جوان بینبە بێ ئەوەی هەست بکەیت لە ڕووی دەرەوەشت نیاز پاکی و جوانبینیت بەدەردەکەوێت.

## بەکێ دەوترێت هاوڕێ؟

ئەوەی ناومان لێناوە هاوڕێ زۆربەی کات دەبن بە هۆکاری ئە وەی خۆمان بناسین و ببین بەخۆمان, بە پێچەوانەشەوە دەکرێت



بەشێك لەوانەی تامەزرۆی دیداریانین و بە هاوڕێ دەیانبینین خراپتربن لە هەرشتێك کە بیری لێ دەکەینەوە, هاوڕێ هەیە کەناری ئارامییە و هەشە گەردەلوولی خراپەکارییە هەیە ئارامی و دڵخۆشیت پێ دەبەخشێت و هەشە دوودڵی و خەمباری هەمیشەییە بۆت, هاوڕێ هەیە وەڵامی چاکەکانت دەداتەوە و چاکەی بێبەرامبەرت لەگەڵ دەکات هەشە بێ نمەکە لە ئاستی هەر چاکەیەك کە بۆی دەکەیت و هەرگیز لەخراپە زیاتر چاکەی بۆت نابێت, زۆر وردبینبە کە کێ دەکەیت بە هاوڕێ و لەکێ نزیك دەبیتەوە زۆربەی کاتەکان ئەوەی بەرەو خراپەت دەبات هاوڕێیە و ئەوەشی چاکەت بۆ دێنێ هاوڕێیە, هاوڕێی زۆر دروست مەکە بەتایبەت ئەوانەی خوی خراپ و سەرگەرمیان تێدایە چونکە هاوڕێکانت ناسنامەی تۆن! ببە هۆکاری سەربەرزی هاوڕێکانت و لەهەمان کاتدا سەربەرزبە بە هاوڕێکانت, ڕەنگە هەموو ئەوانە هاوڕێ نەبن بەڵام ناومان لێناون هاوڕێ و زۆر لەوانەی بە

هاوڕێیان دەزانین دەکرێت لەڕێلادەر بن بەرەو ئامانجەکەت و دوات بخەن لە گەیشتن بە ئامانجەکەت.
هاوڕێیەتی راستەقینە هێندە بە ئاسانی ناگەیت پێی بەڵکوو هاوڕێ بەپێی کات و ئەزموون و مەبەستەکەی ئەو مانا گەورەیە دەبەخشێت, سەختی دۆزینەوەی هاوڕێیەك لەنێو هەموو ئەوانەی دەیان ناسیت ئەوەیە بەر لەوەی بڕیار لەسەر ئەوە بدەیت کێ بکەیت بە هاوڕێی خۆت ئەوەیە خۆت بناسیت و تێبگەیت لە مەبەست و ستراتیژی ژیانت و ئامانجەکانت ڕوون بن و قۆناغی لێڵیان تێپەڕکردبێت, ئەو کاتەی هاوڕێکەت بەپێی ئەو خەونەی کە لە دا هاتوو هەتە هەڵدەبژێریت دڵنیابە لەوەی بەهەموو کەسێك ناڵێیت هاوڕێ و بەبیانوی جیا جیا وازیان لێ بێنیت لە تەمەنێکی کورتی ئەو پەیوەندییەدا, جۆرێکی تری هاوڕێیەتی ڕاستەقینە ئەوەیە کە هەمیشە بەردەوامی بە پەیوەندییەکانت بدەیت لەگەڵ ئەوانەی کە بەبێ بوونی هیچ بەرژەوەندییەك هەواڵت دەپرسن و گرینگی بەو پەیوەندییە دەدەن ئەوانە سامانێکی بەنرخن و پشتگوێیان مەخە.
پێش ئەوەی سەرزەنشتی هاوڕێکانت بکەیت بەوەی فێری شتێکی بەد و خراپیان کردویت خەم لەوە بخۆ خووی باوی هاوڕێکانت چین, چونکە هەڵسان و دانیشتنی بەردەوامت لەگەڵ هەر کەسێك تێکەڵاوییەك لە خووەکانی هەردوولایەن دروست دەکات یاخود دەشێ لایەنێکیان وەربگێڕێت بۆ سەر لایەنی دووەم بۆیە بەهۆش خۆت وەرەوە بەرلەوەی کار لەکار بترازێ.
هۆکاری سەرکەوتن و ژێرکەوتنت بە ڕێژەیەکی زۆر وەستاوە لە سەر هاوڕێکانتەوە هیچ کەس لەخۆوە نایێت دەستت بگرێت و بتبات بۆنێو ئەو دونیا خەیاڵییەی بۆخۆتت دروست کردووە یەکێ لە باشترین ڕێگاکان بۆ سەرکەوتن ئەوەیە بیر بکەیەوە بزانی هەڵسان و دانیشتنەکانت لەگەڵ کێن ئەگەر لەگەڵ سێ کەسی عاقڵ هاوڕێیەتی دەکەیت دڵنیابە دەبی بە چوارەمیان ئەگەر لەگەڵ سێ

کەســـی گەمژە و بێ بەرنامەش هاوڕێیەتی دەکەیت بێ ویســـتی خۆت دەبی بە چوارەم گەمژە!
دەوترێت (ئادەمیزاد کە تێر بوو هەوەسی دەبزوێ) ئەوە جۆرە ڕە وشتێکە لە ئێستادا لەنێو خەڵکیدا باوە, بۆیە تا کەسێك نەناسیت بە ئـەزموون کردن لـەگـەڵی پێت نـەخزێتـە نێو زەلکاوی خـەیاڵـەوە وانـەزانـی هـەموو کـەس فریشتـەن و هـەوڵـی ڕزگارکردنـی تۆ دەدەن لەو نارەحەتییەی تێیکەوتویت نا بەڵکە زۆربەی کات وا بیر بکەوە هەمووان لەدوای بەرژەوەندی خۆیانن! هەوڵ مەدە هەروا زوو خۆت بخـەیتە ژێر دەستی هیچ کەسێکەوە بەتایبەت کەسانێك کە وەك هاوڕێ خۆیان دەناسێنن.
باشـــترین پێناســـەیەك کە لە کوردەواریدا کرابێت بۆ وشـــەی (هاوڕێ) ئەوەیە کە دەڵێت"هاوڕێ ئەو کەسـەیە کە لە کاتە خۆش و ناخۆشـــەکاندا لەگەڵت بێت " هاوڕێ وشـــەیەکی جوان و بژاردنێکی جوانی بۆ کراوە لە زمانەوانی کوردیدا هاوڕێ ئەوکە سـەیە چۆن لەخۆشیدا بەشدارە لەگەڵت لە ناخۆشیشدا هەمانشێوە کە چاکەیەك دەکەی لەگەڵی هەر بە ســـوپاس کردنێکی زارەکی پاداشـتت پێناداتەوە و بە کردار دەیسـەلمێنێت کە سـوپاسـگوزارە باشـــترینەکان ئەوانەن, نەوەك سـپڵەکان کە لە لەوانەیە ئێســـتا لە ژیانت دابن و هەســـتیان پێ نەکەیت هەندێك لەوانە بەجۆرێك دووڕوویی دەکەن هەمیشـــە خەریکی خۆ دەرخســـتنن و لە دواوە پیلانگێڕی دەکەن بۆ دەوروبەریان بۆیە مەبە بە کەسـێك لەوانە و تەنانەت نزیکیان مەبەوە, دڵســـۆزی بکە بە خووێکی بەردەوامت وەفا بنوێنە و بەســـۆزبە دواجار وریابە لەگەڵ کێ ئەمانە دەکەیت و بۆ هەمیشە ئاسودەبە و هەست بە بوونی خۆت بکە.

**دڵنیابەرەوە لە دروستی بژاردەکەت!**

له هەر کار و پڕۆژەیەك ڕەنگە کۆمەڵە بژاردەیەکی جیاوازت لەبەردەستبێت بۆیە ژیرانە بڕیاربدە لە دیاریکردنی ئەو بژاردەیەی کە هەڵیدەبژێریت چونکە ڕەنگە چەند ساڵێکی داهاتووی تەمەنت یەکلایی بکاتەوە کە بە چ ئاڕاستەیەکەوە ڕێدە کات.

دڵنیابەوە لە ئەنجامی ئەو ڕێگایەی گرتووتتەبەر قۆناغەکان ڕەنگە دوورودرێژ بن بەڵام دەبێت کۆتاییەکەی ڕوون بێت, لەبەر ئەوەی ناکرێت ژیانت لە ڕێگایەکدا بەفیڕۆ بدەیت کە هیچی پێ نەبێت بۆت, بۆیە سەرنجی ئاماژە کان بدە و لێکدانەوەیان بۆ بکە نەبادا تەمەنێك لە ڕێگایەکدا بەفیڕۆ بدەیت نەك هیچت پێ نەبەخشێت بەڵکو زۆر لە ڕێگا هەڵەکان کە بە نەشارەزایی دەگیرێنە بەر کۆمەڵە شتێکت لێدەستێیننەوە کە ئاسان نییە بەدەستیان بێنیتەوە ڕەنگە هەرگیز دە ستت پێیان نەگاتەوە گرینگترینیان (کات)ە.




هەندێك جار زیاتر لە بژاردەیەك هەیە و بەهۆی دیاریکردنی ئەو بژاردانەی کە ڕوون و ئاشکران لەبەردەممان بژاردکانی تر نابینین کە پێویستیان بەگەڕان و بەدواداچوون هەیە, بۆیە پەلە مە

کە و بەهرەکانی خۆت حەز و خولیا و ئەو تایبەتمەندییانەی لەتۆ هەیە بۆ کارێك کە ســـەلامەتی ژیانت و بەرژەوەندی تایبەتی و گشتیت دەپارێزن بدۆزەوە, ئەگەر بەدوای هیچ شتێکەوە نەگەڕێیت بۆ بەرەو پێشبردنی خۆت چاوەڕێی بەدەست هێنانی هیچ شتێکیش مەکە.
هەر مرۆڤێك و بەهرەیەکی تێدایە کە ئەوەی پێویســـت بێت بۆ گەشـەکردنی ئەو بەهرەیە تەنها پەروەردەکردنێکی دروسـتە لەلایەن خودی کەسەکەوە ئەو کاتەی بەهرەکانت پەروەردەدەکەیت بەهایەك بەخۆت دەبەخشیت, پاشەکشە مەکە لە پێدانی بەهایەك بەخۆت تەنها لەبەر ئەوەی خەڵکی وا دەخوازن, بەباشــی لێی دڵنیا ببەوە و هەوڵی بۆ بدە و  پەروەردەی بکە بە پەروەردەیەکی دروســـت دواجار بەهایەك بە بوونی خۆت دەبەخشیت بۆ هەمیشـە شـانازی پێوە دەکەیت.

هەستەکانی مرۆڤ فراوان و کراوەن و جۆراوجۆرن بەڵام هەریە کەیان تایبەتمەندی و جیاکاری تایبەتی هەیە و بەپێی کاتەکان و هەڵوێست و بیرکردنەوەمان دەربارەی بۆمان دروست دەبێت.



زۆرجار کاتێک هاوڕێیەک خزمێک کەسێکی چواردەورمان دەبینین بووە بە خاوەنی شتێکی تایبەت (ئۆتۆمبێل, خانوو, بڕوانامە, هاوسەری باش...) یان هەر شتێکی تری بەدەست هێناوە بەگشتی ئێمەی مرۆڤ لەو کات و ساتەدا دوو هەستمان بۆ دروست دەبێت, یان ئەوەتا هەست بە (دڵخۆشی) دەکەین و شانازی بەدەستکەوتەکانی دەکەین لەبەر ئەوەی پێش هەموو شتێک مرۆڤێکە و دڵخۆش بووە بەوەی بەدەستی هێناوە ئەوەش ئاماژەیەکی دروستە بۆمان, یان ئەوەتا هەستی (ئیرەییمان) لا دروست دەبێت ( ئیرەیی) هەستێکی هێندە خراپە هێندەی زیان بەخۆمان دەگەیەنێ زیان بەکەس ناگەیەنێ بۆیە دووربە لە ئیرەیی بردن بەسەرکەوتنی هەرکەسێك بۆ ئەوەی زیان لەخۆت و هەستەکانت نەدەی, ئەو ساتەی هەست بە دڵخۆشی و شانازی دەکەیت بەوەی مرۆڤێك سەرکەوتنی بەدەست هێناوە بەمەرجێك بەهەوڵ و کۆششی خۆی نەوەك بە (فرت و فێڵ) کردن هەستێکی هێندە

ئارامبەخش و پڕ وزەت پێ دەبەخشێ کە دڵ و دەروونت هێمن دە کاتەوە و هانت دەدات بەرە و ئامانجەکانت چونکە تۆش ڕۆژێك لە ڕۆژان دەتوانی بگەیت بەوەی دەتەوێت ئەگەر هەوڵ بدەیت و بێ پسانەوە بەردەوامی بە کۆششەکانت بدەیت چونکە تۆ شایەنی ئەوەیت کە بیری لێدەکەیتەوە و جوڵە دەرەکییەکانت بەرەو ئەو ئاراستەیە هەنگاو دەنێن.

بەڵام بە پێچەوانەوە ئەو ساتەی هەست بە ئیرەیی پێ بردن دە کەیت بەوەی کەسێك شتێکی بەدەست هێناوە, ئەوە ئەو ساتەیە کەخۆتی تێدا ئەشکەنجە دەدەیت و ناخ و دڵ و دەروونت نائارام دە کەیت ئاماژەیەکی نەرێنی خراپ دەگەیێنی بە مێشکت کە (تۆ شایانی نیت) چەندە خراپە وەها هەستێك, لەپێناوی چی جگە لە ئە شکەنجەیەکی دەروونی!

سەروەر و خۆشەویستی مرۆڤایەتی پێغەمبەری ئیسلام (محمد) (ﷺ) دەفەرموێت: (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه) (رواه بخاري و مسلم) ,واتا هەرکەسێك تاکو ئەوەی بۆخۆی پێی خۆشە بۆبرا موسوڵمانەکەی پێی خۆش نەبێ ئیمانی تەواو نابێ, بۆیە دڵخۆشبن بە سەرکەوتن و دەستکەوتەکانی هە رکەسێك و تۆش هەوڵی ئەوە بدە بگەی بەوەی کە دەتەوێت و وزە وەربگرە لە بینینیان نەوەك ئیرەیی پێبردن.

ئەگەر لێم بپرسن ئەو شتە چییە لەیەك کاتدا هەم دوورت دەخاتەوە لە نائارامی دەروون و هەستی هێز و وزەت پێ دەبەخشێت و تە نانەت ئیمانیشـــت بەهێز دەکات ئەوا دەڵێم )ئیرەیی پێ نەبردن) چونکە ئەو ساتەی هەستی ئیرەیی لەخۆمان دوور دەخەینەوە بە پێچەوانەوە هەستی پڕ لە وزە و هێزمان بۆ دروست دەبێت و وادە کات بەخۆمان بڵێین منیش هەوڵدەدەم و دەتوانم بەدەستی بێنم چونکە منیش شایەنیم.

## کات بەسەربردن یان کات بەفیڕۆدان!

واز لە ئاهەنگ و دانیشـــتنە بە کۆمەڵە پوچ و پڕ لە چەنە چەنە کانت بێنە, حەز بە فەشەل ناکەی ناتەوێت بکەوی لەهەمان کاتیش ناتەوێت هەوڵ بدەیت ناتەوێت ماندووبیت و فێربوونت ناوێ , (چەنی بە چەن)!
ناتەوێت بەرەو پێش بچیت چونکە کاتەکانت دابەش نەکردووە تۆ بێ بەرنامەیت بێ ئامانجیت چونکە نازانیت چی دەکەیت و چۆن دەژیت دەتەوێت ســـەکەوتووبیت و حەز لە بەرەو پێشـــچوون دە کەیت؟
کەوایە واز لەو دانیشـــتنە پڕ و پوچ و بێ بنەما و بێ مانایانە بێنە .!!



بەهەموو شــتێك هەڵدەپەڕی بەهەموو شــتێك ئاهەنگ دەگێڕی لە خۆشی و ناخۆشیا تەقە دەکەیت  لەخۆت پرسیوە چەك چییە؟
دەزانی چەك چییە؟
بۆچی بەکار دێت؟
مەترسی چییە؟
نا دەزانم هیچی لەبارەوە نازانی یان دەزانی و خۆتی لێ گێژ دە کەی.

لەخۆت پرسیوە ژیان چییە بۆ دەژی لەوانەیە بڵێیت خودا ئێمەی دروست کردووە لەو ساتەی دێینە بوون تا دەمرین لە تاقیکردنە وەداین باشە هیچ نەبێ ئەوە دەزانی کەوایە بۆ خۆشی دەربڕین بە تەقە!! بۆ بەچەك بەو شێوە هەڵسوکەوت دەکەی تازە هاتبیتە سەر زەوی, دڵت بە چی خۆشە دەنگەکەی؟ یان پشێوی و مەترسی دروست کردنەکەی؟ سەیرت بەخۆت دێت لە مەجلیس و کۆڕە بێ ماناکانت باس لە مرۆڤایەتی دەکەیت, قەت نابیت بەخۆت دەزانی بۆ؟ لەبەر ئەوەی ئەو ڕووەت بەرچاوبێت, کاریگەری خراپی هەیە بۆت هەمیشە ڕووێکی تر پیشان دەدەیت!.
بەرنامەت چییە و چی دەکەیت پلانی ڕۆژانەت چییە بەچی بە سەری دەبەیت دادەنیشی و قسەی هەزەلی و بێ مانا دەکەیت بە درێژایی ڕۆژ وە پێی دڵخۆش دەبیت؟ بیری لێ بکەرەوە.
قسە لەسەر هەموو شتێك دەکەیت چەنەی خۆتت پێ ناگیرێ لەباسی تەندروستی دەبیت بە دکتۆر و لە وەرزشا لێکۆڵەری وەرزشی و لە سیاسەتا توێژەری سیاسی و لە پەروەردەیا مامۆستای دەچیتە نێو هەموو باسێکەوە چەنەبازی و قسەی بێ مانا دەکەیت و زانیاری هەڵە دەگەیەنی, نمایشی هەموو جۆرە کەسایەتییەك دەکەیت و لە هەموو باسێکا قسە دەکەی دەزانی ببی بە گوێگر؟ یان تاقیت کردۆتەوە؟ یانیش بەس دەزانی قسە بکەیت وا پیشان بدەیت بووی بە (مەلای حەوت عیلم) لەبەر ئەوە وایت چونکە تا ئێستا نەبویتە خاوەنی کەسایەتی خۆت هەمیشە وا پیشان دەدەیت کە هەموو زانیارییەك لە هەموو زانستێك دەزانیت!.
دووربکەوە لەو ئاهەنگ و دانیشتن و کۆبوونەوە بە کۆمەڵە بێ ناونیشان و بێ بنەمایانە ئەگەر نەتتوانی سوودێك بگەیەنی بهێڵە خەڵکی سوود بگەیەنن و قسە بەکەس مەبڕە تاقی بکەوە و ببە بە گوێگر یان بە قسەکانت سوود بگەیەنە یان گوێگربە و سوود وەربگرە.
هەمیشە کەسە بچوکەکان ئەوانەن گەورەیی خۆیان لە بە بچوك سەیرکردنی کەسانی ترەوە دەبینن و بە گاڵتەپێکردن و

دابەزینەســەر  ئەو کەســانە دەیانەوێ بچوکی و گزگڵی خۆیان لە بچوك پیشاندانی کەسانی ترەوە بشارنەوە, دووربە لەو دانیشتن و کۆڕ و کۆبونەوانەی لەو جۆرە کەسـانەی تێدایە کە خۆیان ناناسن و بچوك بچوك خۆیان دەبینن و شـێواویەکی دەروونی سـەرتاپای هزریانی داپۆشیوە.

## سەرچاوەی بڕیارەکانی ژیانی خۆتبە!

ببە بەخۆت بە شــێوەیەك هیچ کەس هێندەی خۆت ڕەفتار و بیرکردنەوە و هەنگاو و ئامانجەکانت و ئاڕاســتەکانی ژیانت و

بڕیارە دروســـــت و پەیوەســـــتەكانی تایبەت بە ژیان و كارەكانی ئەمڕۆ و پلانەكانی سبەیت نەناسێت و نەزانێ و بڕیاری لەسـەر نەدات, ناچارنیت كەس لە شـــوێنی تۆ بیر بكاتەوە مادام هەیت مادام بوونت هەیە و مادام درك بەخۆت دەكەیت بیربكەرەوە و بڕیارەكانی خۆت خۆت بیاندە.

هەمیشــە ئەوانەی ژیانێكی (هەژموون-پاشـكۆیی) بەسـەر دەبەن دوودڵن لە گەورەبوونی خۆیان, تەنانەت دەســـتبەرداری بوونی خۆشـــیان دەبن چونكە گۆڕانكاریان ناوێ و ئارەزوی ناكەن, هەژموون بە مانای بوون و پاشكۆیی بە مانای هەست نەكردن بە بوون و نەبوونی ئامادەگی بۆ بەرەو پێش ڕۆشتن و دروستكردنی ڕێڕەوی گۆڕانكاری و بڕیاردان لەسـەر ئەوەی خۆی بڕیار بدات نەوەك دروستكردنی سەردار و ڕێبەرێكی نەشارەزا كە هەست بە توانا و بوونی تۆ و تەنانەت تواناكانیشـت ناكات چونكە لە ناخەوە هێزێكی شـــاراوە لەتۆدا بوونی هەیە (كوشـــتووتە) یانیش هێدی



هێدی خەریکی خنکاندنی ئەو هێزەیت, (هەژموون-پاشــــکۆیی) خراپترین جۆری مامەڵەکردنە لەگەڵ بوونی خۆتدا دەیکەیت, بێ ئەوەی ناچاربیت کەسێك دەکەیت بە سەردار و خۆشت بە ژێردەستەی ئەو دەبینی هۆکارەکەشی ئەوەیە هێشتان خۆتت نەدۆزیوەتەوە و چارەســـەرەکەشـــی لای خۆتەوەیە و بیدۆزەوە لە ناســـینی خوودی خۆتدا.

هەمیشــە ئەوانەی بە بەردەوامی و بە شـێوەیەکی دووبارە و چەند جارەیی و زیادەڕەوی خەریکی نواندنن و خوویان بە وشـەی سەرکـەوتنـەوە گرتووە و دووبـارەی دەکـەنـەوە لـە ژێر فشـــــاری شکستدان یانیش لە شکستدا دەژین و بە قسەکانی دیوێکی تر پیشان دەدات ئەو جۆرە کەســـانە ئارەزووی ســــەرکەوتن دەکەن بەڵام هەوڵی بۆ نادەن, لالۆ لەوانە مەبە نەبادا ڕەهەندێکی تری ئەم نمایشـــە ببێت بە خوویەك لەتۆدا و شـــانازی و دەســـتکەوتەکانی کەســـانی تر بەتەنها چرکاندنی وێنەیەك لەگەڵیاندا بە دەســـتکەوت ببینی.!

توانستی بیرکردنەوە و هەست کردن بە بوونی خۆت و بڕیاردان لەســـەر ئەوەی خۆت خاوەنی خۆتبی و داڕێژەری دیاریکردنی ڕێچکەی ژیانی خۆتبی بەوە نابێت لەنێو جەنجاڵی هەموو ئەوانەی خۆیان نین گیر بخۆیت و ببیت بە یەکێ لەوان, هیچکەس لە کەسی تر ناچێت و کەســیش وەك یەك بیر لە شـــتەکان ناکاتەوە کەواتە لەپێناوی خۆتدا ئەوە بکە کە دەتەوێ و ئەو بڕیارە بدە کە دوای ئاشـنا بوونت بە بابەتەکە و داڕشـتنی هەنگاوەکان و ئەنجامدان و هەڵســـەنگاندنی پلانت بۆی داڕشـــتووە نەوەك ئەو بڕیارە هەڕەمەکییەی کەســـێك لەخۆیەوە بۆتی دەدات, دڵنیابە لەوەی هیچ کەس هێندەی خۆت نازانێت داهاتووی تۆ چی پێویستە ئەو کاتەی خۆت دەناســیت و لە هەوڵی خۆناســیندایت بە تەواوی درکی پێ دەکەیت.

## تەمەن پێوەری کەسایەتی نییە!

هەمیشـە شـانازی بکە بە تەمەنی خۆتەوە وا هەسـت بکە کەسێکی بەســـوودی و بوونت هەیە لەنێو کۆمەڵگا, شـــانازی بکە کە

تەمەنێکی کەمت هەیە و گرینگی بۆ داهاتووی کۆمەڵگا و هەوڵی پێگەیاندنی خۆت بدە بزانە هەلی زۆرت لەبەردەمە بۆ ئەوەی بونیادی کەسایەتی خۆت بنێیت, ئامانجێك دیاری بکەو کاری بۆ بکە و بەردەوامبە سارد مەبەوە تا پێی دەگەیت, شانازی بکە کە گەنجێکی و بڕبڕەی پشتی کۆمەڵگای و توانا و هێزی بەرهەمهێنان و کار لەسەر توانای تۆ وەستاوە سوود لە خاڵە ئەرێنییەکانت وەربگرە و هەڵەکان دووبارە مەکەوە و



بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێ تا کەسایەتییەك بۆخۆت بونیاد بنێیت, لە ڕابردووی خۆت ناڕازی و تەمەنێکی زۆرت هەیە و پەشیمانی لە ڕابردووی خۆت, وا حاڵی بویت ژیان بۆتۆ کۆتایی هاتووە بزانە لە هەڵە دایت گرینگ نییە لە چ تەمەنکدایت ئەو کاتەی بڕیارێك بۆ ئاڕاستەیەکی نوێی ژیان دەدەیت ئەوکات بۆتۆ دەستپێکێکی نوێیە هەست بە شەرمەزاری مەکە کە هەست بە سپی بوونی تاڵەکانی قژت دەکەی و ڕۆژ دوای ڕۆژ تاڵە سپییە کانت زیاد دەبن چونکە ئەوکاتە تۆ کەسێکی بە ئەزموونی و ڕێز لێ گیراوی هەم لەلایەن خودای گەورە و هەمیش لەلای بەندەکانی خودای گەورە خاوەن کەسایەتییەکی تایبەتی, بۆیە ترس داتنەگرێت لە هەڵکشانی تەمەنت وا هەست بکەیت دونیا بۆتۆ

تەواو بووە هەموو ئەو ڕابردووە بکە بە ئەزموون بۆ ئەوەی هەڵە کان دووبارە نەبنەوە و دەســـت بە ســـەرەتایەکی تازە بکەوە لاپە ڕەیەکی نوێی ژیان هەڵبدەوە ئەوکاتە دووبارە لە دایك دەبیتەوە, لەو ساتە ژیان بۆتۆ دەست پێدەکات تا ئەوکاتەی بوونت هەبێت بە ڕوح و جەســـتە بە هزر و هۆش بە کار و کردەوە بەشـــێکی لە کۆمەڵگا و دونیای مرۆڤایەتی هەســـت بە بوونی خۆت بکە بۆ ئە وەی هەســـت بە بوونت بکرێت تا ئەوکاتەی ڕێز لەخۆت نەگریت ڕێزت لێ ناگیرێت وەك چۆن دەوترێت "چاکە بکە چاکە دێتە ڕێت" چۆنیش خۆت ببینیت بەو شـــێوەیە دەبینرێیت, لە ڕوانگەی بینینی خۆتەوە کەســـەکان دەتبینن, ئەگەر بێت و لە بەرزترین پێگەی ئایینی-کۆمەڵایەتی-بەڕێوەبەری-ســـەرکردایەتی و...هتد دابیت کە خۆت نەتتوانی خۆت ببینی لەو پێگەیە و هەست بەخۆت نەکەیت لە ڕووی بەرپرسیارییەتی ئەو پێگە و پلە و پۆستە نەبیت ئەوکات کەس بەو شێوەیە ناتبینێت.

لەوانەیە منداڵێکی بچوك بتوانێت زۆر شـــت بکات, گەورەترین شت قسە کردنە بەڕێزەوە هەرچەند تەمەنێکی کەمی هەبێت بەڵام ڕەنگدانـەوەی هـەڵســـوکـەوتی ئـەو منداڵـە بۆ (دایبـاب) و پـە روەردەکارانی دەگەڕێتەوە چونکە هێشتا درکی بەخۆی نەکردووە و هێدی هێدی بەپێی ئاســـتی هۆشـــیاری گۆڕانکاری بەســـەر ڕەفتارەکانیشـــیدا دێت, تا نەتوانیت چاکســـازی لەخۆتدا بکەیت ناتوانیت چاکسـازی و پاکسـازی لە ڕەفتاری منداڵەکەشتدا بکەیت ئەوکاتەی کە جگەرەیەك بەدەستتەوەیە چاوەڕێی ئەوە مەبە منداڵە کـەت ئـامۆژگـارییـەکـانـت وەربگرێت کـە بـاســـی مـەترســـی و زیانەکانی جگەرەی بۆ دەکەیت و ئاگاداری دەکەیتەوە کە دەســـتی بۆ نەبات (نەیکێشـــێت) ئەوکات تەمەن هیچ ڕۆڵێکی نابێت و تە نانەت قســـەکانت کاریگەریان نابێت هەتاکو ئەوەی بە خەڵکی دەڵێیت خۆشت جێبەجێیان نەکەیت.

**هەندێك سات بەتەنیابە!**



زۆر شــت لەخۆت و لە تەنیاییەکەتدا فێردەبیت کە هیچ کەس پەی پێنابات ئەوە خۆتی دەبێت پێش ئەوەی خەڵکی بناســـی و بتناســـن خۆت بناسیت شارەزایی و خودناسیت واتلێدەکات و شیارانە مامە ڵە لەگەڵ بارودۆخەکان بکەیت پەیڤێکی (دانیمارڕك)ی هەیە دە ڵێت: (مرۆڤ دەبێت لەگەڵ خەڵکیدا کەم و لەگەڵ خۆیدا زۆر بدوێت) گفتوگۆ لەگەڵ خۆتدا بکە لێکدانەوە بۆ ســـاتەکانی ژیانت بکـە ئـەوکـات دەزانی بۆ دەژیت چی دەکـەیت و ئـامـانجت چییە لەژیان ئایا هەموو کەســـێك کە هەناســـە دەدات دەژیت؟ کێن ئە وانـەی دەتوانن بژین؟ ئـەو کـەســـەی خۆی بنـاســـێت چاکـە و خراپەکانی جیا بکاتەوە دان بە هەڵەکانیدا بنێت و کاریان لەســـەر بکات و چاکسازیان بکات پاشان ئامانجێکی ڕوونی لەژیان هەبێت

و لەپێناویدا بژیت, ئەو کەسە دەتوانێ بژیت چێژ لەژیان ببینێت و سەرکەوتوو بێت, فەیلەسوف و ڕەخنەگری یۆنانی و لاتینی (فریدریك نیتچە) دەڵێت: (ئێمە لە خێزانەوە فێری پەروەردە دەبین, لە کۆمەڵگە فێری زانست و لە تەنیاییشدا فێری خۆناسین دەبین) تەنیایت بقۆزەوە لە بەرژەوەندی خۆتدا لەو کاتانەی تەنیای بیر لەو ساتانە بکەوە کە چواردەورت قەرەباڵغە بە خۆشەویستانت و هەستی خۆشەویستیت بۆیان نوێ بکەوە, هەست بە تەنیایی مە کە چونکە لەگەڵ خۆتی ئەوە دەرفەتە و لەگەڵ خۆتدا بدوێ بزانە ڕۆژانە خەریکی چیت و کاتەکانت بەچی بەڕێ دەکەیت ئایا ئەو کارانەی دەیانکەیت دوورت دەخاتەوە لەخۆت و ئامانجەکەت یان یارمەتیدەرە بۆت ئایا زیانت پێدەگەیەنێت یان سوود بە ئامانجەکانی تۆ دەبەخشێت, ئەوە یارمەتیدەرێکە بۆت تا نزیك بیتە وە لەڕێگا ڕاستەکان و ڕێگاکەت ون نەکەیت.

خەم مەخۆ چونکە جارێ دەرفەتت ماوە دەتوانیت خۆت بگۆڕیت, کۆتایی بە خراپەکان بێنیت و خووی باش پەرە پێبدەی پەرەپێدانی خووە باشەکان دەتگەیەنن بە کەنارێکی ئارام, ژیان وێستگەیەکی دوورودرێژە هەمووکات چواردەورت پڕ لە خەڵکی نابن ،ارودۆخ و ئاڵەنگاریت بۆ دروست دەبێت کە وادەکات هەست بە تەنیایی بکەیت, تەنیایی بەشێکە لەژیان ئەوەش بۆ مرۆڤ بێ مەبەست نییە بۆ نموونە مەبەست لە تەنیایی دەکرێت پێداچونەوەیەکی ڕۆحی و کرداری بێت, هەمیشە ڕووی دەممان لە خەڵکییە و گلەیی دەکەین بەوەی خەڵکی وان و خراپەکارییەکانیان دەبینین و دەیانژمێرین بەڵام هەرگیز لەخۆتت پرسیوە خەریکی چیت و کار لەسەر خراپەکانت بکەیت و بەرەو باشیان ببەیت کارە باشەکانت بەرەو باشتر ببەیت, ئەگەر تا ئێستا ئەوەت نەکردووە لە ئێستاوە بەڵێن بەخۆت بدە بیکەیت ئەگەر کردووتە بەردەوامبە لەسەری, خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سوڕەتی )الرعد) دە فەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ ۗ)

(١١) واتا بێگومان خودا بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت هەتا ئەوان ئەوەی بەخۆیان دەكرێت نەیگۆڕن و نەیكەن.

## تۆ گەورەتری لەوەی گۆشەگیرببیت!

گۆشەگیرەکان فەرامۆش مەکەن !
زۆربەی ئەوکاتەنەی مرۆڤ گۆشـــەگیر دەبێت لە ئەنجامی چەند شــتێکەوەیە لەوانە گرینگی پێنەدانی هەم لەلایەن خێزانەکەی هەم کەسـانی تر, فەیلەسـوف و ڕەخنەگری یۆنـانی و لاتینی (فریدریك نیتچـە) دەڵێـت : (گـریـنـگـی بــە کـــەســـــانـــی گۆشــەگیر, بدەن بـۆ مـرۆڤـێـکـی تەنـیـا تەنـانەت ژاوەژاویـــــش جێی دڵـدانەوەیە ) لـەوانـەیـە لـە دەوروبـــــەرت کەسانی وا هەبن کـە پێویســتیـان بەتۆیە ســڵاوێك ئـــــەحـــــواڵ پرســـینێکی تۆ بۆ ئەو زۆرە یارمەتی دەدات تا بەرەو باشـــبوون بچێت بەردەوامبن لەگەڵیان با بەتەنیا نەبن دڵخۆشـیان بکەن نەبادا گۆشەگیرییەکەیان باڵبکێشێ بۆ دروست بوونی گرێیەکی دەروونی و ڕەشـــبینی ئـەوە بـارودۆخـەکـەیـان ســـــەختتر دەکـات تێکـەڵی کۆمەڵگایان بکەنەوە و یارمەتیان بدەن هاوبەشــی خۆشـیەکانتانیان پێ بکەن با هەسـت بە نامۆیی نەکەن لە پشـتیان بن و پشـتگیریان بکەن لەو کاتانەی حاڵەتێکیان بەسەر دێت.



لە فیلمی

(Alexander and the Terrible, Horrible, No Good, Very Bad Day-٢٠١٤)
(ئێد ئۆکسێنبۆلد) کە ڕۆڵی (ئەلێکساندەر) دەبینێ و تەمەنی تەنیا (١٢) ساڵانە زۆر هەست بەتەنیایی دەکات وادەزانێ کەس گرینگی بەو نادات دایك و باوکی خوشك و برای هەموویان سەرقاڵن بەکاری خۆیانەوە و ڕۆژی پێش ڕۆژی لەدایك بونیەتی بەڵام تەواوی شتەکان لەو ڕۆژە پێچەوانەی خواست و ویستەکانی ئەون لە قوتابخانە توشی چەند ڕوداوێکی ناخۆش دەبێت هەست بە تەنیای دەکات لەبەر ئەوەی وادەزانێ کەس هەست بە تەنیاییە کەی ئەو ناکات, شەو بەتەنیا لەسەر کێکێکی بچوك مۆمێك دادەگیرسێنێ هیوای ئەوە دەخوازێ کە (ئەوان تێبگەیشتنایە ئەو هەستە چۆنە کە ڕۆژێکی زۆر خراپت هەبێت) فوویێك لە مۆمەکە دەکات بۆ بەیانییەکەی خێزانەکەی توشی چەندین ڕووداوی ناخۆش دەبن و ڕۆژەکە بۆ ئەوان تەواو شوم و ناخۆشدەبێت هەرچەند ئەو خۆی بە تاوانباری ئەو ڕووداوانە دەزانێ لەبەر ئەوەی شەو ئەو هیوایەی خواستووە و ئەوەیان پێ دەڵێت, لەوکاتەی باوکی خەریکە توڕەییەکەی بە لێدان لە تەنەکەی خۆڵەکان دەردەکات خێزانەکەی دەچنە لای و (ئەلێکساندەر) بە پڕ وزەییەوە بە باوکی دەڵێت: (باوکە, پێویست ناکات هەمووکات کەشتییەکەت بە وزەی ئەرێنییەوە لێبخوڕیت, تۆ ئێمە دەپارێزیت و ئێمەش ئەوە زۆر بەرز دەنرخێنین, بەڵام هەندێك لە ڕۆژەکان خراپن, پێویستە ڕۆژی خراپت هەبێت بۆ ئەوەی بیری ڕۆژە خۆشەکان بکەیت) هەرچەند (ئەلێکساندەر) هەستی بە تەنهایی دەکرد لەوکاتەی کێشەی هەبوو بەڵام کەس نەبوو گوێ بۆ ئەو بگرێت ئەوکاتەی خێزانەکەشی کەوتنە ئەو حاڵەتەوە پشتگیری خێزانەکەی بوو هەرچەند تەمەنێکی کەمی هەبوو بەڵام هەستی بە شتەکان دەکرد و قسەی بۆ دەکردن و ورەیانی بەرز دەکردەوە بە قسەکانی, دواتر شتەکان تەواو پێچەوانە بوونەوە کۆتاییەکی باشی هەبوو ڕۆژەکە, ئەوە وانەیەکە بۆ هەر یەکێکمان گرینگی بەو کەسانە بدەین کە

هەستی تەنهاییان بۆ دروست دەبێت پێش ئەوەی گۆشەگیربن پشتگیریان بکەین ئەو هێزەی لەواندا هەیە تەنها خۆیان هەستی پێ دەکەن بۆیە پاڵپشتیان بن و هاندەریان بن.
گۆشەگیر مەبە لەبەر ئەوەی گۆشەگیری مەترسی دەروونی دروست دەکات کە زیانەکانی بۆ مرۆڤ هاوتای زیانی جگەرە کێشان و قەڵەوین, دوورکەوە لە گۆشەگیری و خەمەکانت دەربڕە کێشەکانت بە کەسە نزیك و متمانە پێکراوەکان بڵێ بەو کەسانە بڵێ کە یارمەتیت دەدەن لە پشتتن و پشتگیریت دەکەن هانت دەدەن ساتە سەختەکان تێبپەڕێنی, بەڵام وریابە کەسانێکی هەڵە هە ڵنەبژێریت وەك خوێ بن بۆ برینەکانت, خۆ ئەگەر هاتوو کەسی وات لە ژیانت شك نەبرد پەنا بۆخۆت ببە لەگەڵ خۆت بدوێ قسە بۆخۆت بکە بڕۆ بەرامبەر ئاوێنەیەك و قسە بکە چیت لە دڵ بوو دەری ببڕە گرینگ نییە چەندە قسە دەکەی تەنها خۆت بەتاڵ بکە وە لە هەموو ئەو هەستانەی نەرێنین و دژ بەخۆتن.
ئەوەی گرینگ بێت تۆیت خۆتت خۆشبوێ چونکە تۆ لەهەموو ئەو کەس و شتانە گەورەتری کە هەوڵ دەدەن تۆ بە هەموو بوونتە وە لە سوچێکدا کۆ بکەنەوە.
لە ئایینی ئیسلامدا بەپێی ڕۆژژمێری (کۆچی) مانگی (نۆ)ی هە موو ساڵێك مانگی (ڕەمەزان)ە لەو مانگەدا گرینگترین شت کە ( خواردن و خواردنەوەیە) لە ژیانی مرۆڤ, خۆی لێ دەگرێتەوە بەپێی ئەو توێژینەوەی (ئەبراهام ماسلۆ) ,ساڵی ١٩٤٣ کە باس لە (هەڕەمی پێداویستی) کردووە, واتە مرۆڤ لە ژیانیدا پێوستی بە چییە؟ !لە یەکەم پێداویستی مرۆڤدا، (خواردن)ی داناوە, خواردن و ئاو و هەوا، یەکەم پێداویستیەکانی مرۆڤە بەدوای ئەوە (سەلامەتی و ئاسایش) دواتر (خۆشەویستی) و دواتر ( ئازادی و ڕێز) و دواتر (ویستی باڵابوون)ە.
لێرەدا بەڕۆژوو بوون لەو مانگەدا چەند ئامانجێکی هەیە بۆ مرۆڤی باوەڕدار ئەوەش گەورەیی خودای باڵادەست پیشان دەدات, یەکێ لەوانە خۆ گرتنەوەیە لە سەرەکیترین هۆکارەکانی

ژیان کە خواردن و خواردنەوەیە, ئەی مرۆڤ تۆ کە بتوانی واز لە سەرەکیترین و یەکەم پێداویستی ژیانت بهێنی دڵنیابە لەوەی دەتوانی واز لەو کەسە, شتە, کێشەیە بهێنی کە هۆکاری بێ ئۆقرەیی و غەمباری تۆیە هیچ شتێك ناتوانێ گۆشەگیرت بکات ڕات بگرێ بتروخێنێ, تۆ لەهەموو ئەو شتانە گەورەتری بەهێزتری سەرکەوتوتری تەنها ئەوەی پێویستت پێیەتی ئەوەیە خۆت ڕابهێنی و خۆت کۆنترۆڵ بکەیت و بگونجێی لەگەڵ بارودۆخەکان بەتەنها مەبە و خۆت سەرقاڵ بکە بە خولیایەك ئارەزویەك گەڕان و سەفەر کردن هەر شتێك کە ئەو پاڵەپەستۆ دەروونیەت لەسەر لاببات.

## ئامانج له‌ نێوان خه‌ون و قبوڵكردنی ڕاستییه‌كاندا!

سروشتی مرۆڤ خه‌ونی هه‌یه‌ و ئاره‌زووی ده‌ستكه‌وت ده‌كات, ئاره‌زووی له‌ سه‌ركه‌وتنه‌ و له‌ پێناویدا تێده‌كۆشێت له‌وانه‌یه‌ چه‌ندین ڕێگری بۆ دروست ببێ, به‌ڵام هه‌رگیز نابێ ئه‌و ڕێگریانه‌ بت وه‌ستێنن هه‌وڵده‌ تێبكۆشه‌ به‌ره‌نگار ببه‌وه‌ تا ده‌گه‌یته‌ سه‌ركه‌وتن تا به‌ خه‌ونه‌كانت ده‌گه‌ی, مه‌هێڵه‌ وه‌ك خه‌ونێك بمێنێته‌ وه‌ چونكه‌ تۆ ده‌توانی بگه‌ی به‌وه‌ی ده‌ته‌وێ تۆ به‌هێزی هه‌وڵده‌ده‌ی



ناشكێی له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خه‌ونت هه‌یه‌, ده‌بێت ئه‌و ڕاستییه‌ بگۆڕیت چونكه‌ ڕێگره‌ له‌ خه‌ونه‌كانت.
مه‌شكێ ئه‌گه‌ر شكستت خوارد ئامانجت مه‌گۆڕه‌ بیر له‌ ئامرازه‌ كان بكه‌وه‌ هه‌ڵه‌یه‌ك هه‌یه‌ بیدۆزه‌وه‌ وه‌ك ئه‌وه‌ی به‌سه‌ر پلیكانه‌یه‌ك

بکەوی نەخشەو کوێرەوەری (ستڕاتیژی) بۆ دابڕێژە دەگەیتە خە ونـەکـانـت زوو یـان درەنـگ گرینـگ نییـە گرینـگ ئـەوەیـە پێی دەگەیت شکستت قبوڵ نەکرد, بەربەستەکانت تێپەڕاند.

"یەك تۆ هەیە دەتوانی ببی بەخۆت" سـەردەمی ئێسـتا سـەردەمی توندوتیژی و بەکارهێنانی چەك و سـەپاندنی خۆت نییە بەسـەر کەسـانی تر, وەك لە سـەردەمانی زوو باوبوو خەڵکی لەبری ئە وەی بیر لە گۆڕینی ئامرازەکانیان بکەنەوە کەسانی تریان بەبەربە ست دەبینی لەبەردەم خۆیان و لەناویان دەبرد ئیدی جگە لە یاسای دارستان لە هیچ یاسایەکی تردا ئەوە جێگای نابێتەوە, بەکارهێنانی ڕق و توندوتیژی و دروسـتکردنی ئاسـتەنگ لەبەردەم کەسـانی تردا لەپێناوی بەرەوپێشـچونی خۆت بێ دەسـەڵاتی خۆت دەسـە لمێنێت لەبەردەم خودی خۆتدا و بەو کارەت شـکسـتی خۆت ڕادەگەیێنیت.

سەردەمی ئێستا بریتییە لە هەوڵ و کۆشش و قوربانیدان بە شتێك لەپێناوی شـتێکی تردا کە خۆت لێی بەرپرسـیاربیت نـەوەك قوربانیدان بە کەسێك لەپێناوی خۆتدا بەبێ ڕەزامەندی خۆی.

ئامانجەکانت بوونی تۆ و کاریگەری و کەسـایەتی تۆ پێناسـە دە کەن بۆیە خۆت هەوڵ بدە و کێبڕکێ بکە و تواناى خۆت بسەلمێنە لەبری ململانێی توند و بێ بەرهەم و زیان گەیاندن بەکەسـانی دەوروبەرت لەپێناوی بەرەوپێشـبردنی خۆت, بۆیە ئامانجەکەت دیاری بکە و بەرەو پیلی برۆ و بەرنامەڕێژی بۆ بکە بە دانانی هەنگاوەکانت و ڕیزبەندی کردنی ئامرازەکانت, ژیرانە کاربکە و هەوڵ و کۆشـش بکە و تواناکانت بخەرەگەڕ ئەوکاتە خۆتی و دەگەیت بەو شوێنەی کە شایەنی تۆیە بە پێچەوانەوە مافی کەسێکی تر بەسەر شانتەوەیە.

**هەمیشە وابکە پارێزگاری لە ئارامی مێشك و دڵ و دەروونت بکەیت!**

دەمـەوێ بـە هێمنی بـە گوێتدا بچرپێنم پێت بڵێم بـەهاری تۆ ئـەو ساتەیە کە دڵ و دەروون و ڕۆح و جەستەت هەست بە ئارامی دە کات, هەناسەیەکی قوڵ هەڵمژە و بەهێمنی و لەسەرخۆ بە دەم بیدە وە چەندە ئارامبەخشە!

هیچ شـــتێك و کە سێك ناتوانێ هێزی ئـارامبـەخشـــی نـاوەکـی تـۆ تـێـك بـدات ئـەگـەر تۆ پـێشـــتـر ڕێـگـا خۆشـکەر نەبوبیت بـۆی, بـۆیـە بـۆ بـــەردەوامـــیـت پێویســـتت بەوەیە جـڵــەوی هـێـزی ئـارامی نـاوەکیت نەدەیت بە دەســتی هـیـچ کـەســێـك ئەگەرنا وەك تۆپی باڵە هەڵتدەسوڕێنێ بێ ئەوەی هەســت پێ بکـەی, ئـەوەش لەچەند ڕێگایەکە وە دەکرێت لەوانە




خاڵی لاوازی خۆت مەدە بەهیچ کەســێك بۆ ئەوەی نەبیە ژێردە

ستەی و هەم یاریت پێ بکات بەدڵی خۆی و هەمیش ببێت بە تە ماشاکەر چێژ ببینێ لەو جەنجاڵیەی کە تێیکەوتویت.
هاوڕێ, ببە بەخۆت لەپێناوی کەس نا لەپێناوی خۆت ئارامبەوە لەسەرخۆ و هێمنبە چێژی دونیا لەوەدا دەبینییەوە نەوەك لە دوودڵی و بێ ئۆقرەیی ژیانی هەر یەکێکمان لەدەستی خۆیەتی براوەی ژیانیش ئەو کەسەیە خۆی ببینێتەوە لە هێمنی و ئارامگری و لەسەرخۆیی نەك دوودڵی و بێ ئۆقرەیی و هەڵە شەیی, دەبێ باوەڕ بەوە بکەی ئەوە ڕێگایەکی ئاسانە بۆ دەرچوون لەنێو جەنجاڵی ژیان هەرچەند بارودۆخەکان سەخت بن و ژیان و چارەنوس بەدڵی تۆ نەبن سوودێك نابینیەوە لەو هەستە بێزارکە رانە بەپێچەوانەوە ئارام ببەوە ئەگەر کێشەیەکت هەیە چەند ساتێك بەبێ دەنگی و لە شوێنێکی ئارام بیر بکەرەوە خاڵی دەستپێکت لە کوێ بوو وە ئێستا لەکوێی و چارەنوس بەرەو کوێی هەڵدێراوی دەتەوێت بەرەو چ ئاڕاستەیەك بڕۆیت نەخشەو پلانەکانت چییان بەسەر هاتووە چارەسەرێك دەدۆزیتەوە پشت بەخودا ببەستە و بەردەوامبە بە گومان مەبە لەوەی خودا بۆتی داناوە ئەوەی خێری تێدابێت هەر ئەوە دەبێت بەمەرجێك پشت بەستوو بەخودابیت و دڵت و نیەتت و کردارەکانت ئاوەهابێت کە خودا لەخۆت توڕە ناکەی ڕێگاکان کراوە دەبن بۆت خودای گەورە لەگەڵ ئارامگرانە (إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) (البقرة) )١٥٣).
جا لێرەدا مەبەست ئەوە نییە ئیتر دەستەوەستان ڕابوەستی لەئاستی ئەو ئاڵنگاریانەی کە دێنە پێشت بەڵکو پێش هەموو شت کە بیری لێ بکەیتەوە دوای پشت بەستن بەخودای گەورە پشت بەستنە بە خودی خۆت بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو پلیکانانەی کە لەپێشتن, هاوسەنگی لە ئارامی مێشکت ڕابگرە و مەهێڵە بەلایەکدا شۆڕببێتەوە چونکە جگە لەخۆت کەسی تر باجەکە نادات, ئەو کاتەی مرۆڤ هێندە ئارامی مێشکی خۆی لەبەرزی دەبینێ وا هە ست دەکات هەموو دونیا لەژێر کۆنترۆڵی ئەودایە و هەموو شتێك لەشوێنی خۆیەتی و هەمان شێوە ئەو کاتانەی وا هەست دەکات

هیچ شـــتێك لەجێگای خۆی نییە و هەموو بارودۆخەکان لەدژی ئەو دێنە پێش ئیتر تووشـی دڵەڕاوکێ دەبێت, ئەم هەسـتە نەرێنیانە هەستێکی خراپن و خۆتیان لێ بەدوور بگرە, وە هەمیشە ئامادەبە بۆ دەستپێکردن بە ڕۆژێکی نوێ و کارکردن بۆ دڵخۆشی سبەی و ئارامی بەخۆت بدە و بیبەخشـــەوە بەکەســـانی تر چونکە ئەوە دڵخۆشت دەکا و خۆشەویستیشت لەنێو خەڵکی لەهەڵکشان دەبێت, وە دوور بکەوە لە تێکدانی ئارامی مێشـــك و دڵت وابەســـتە مەبە بەهیچ شـــتێکی لاوەکیەوە بۆ ئەوەی چرکەکانی ژیانت بەفیڕۆ نەدەیت و بەردەوامبیت لەپێشکەوتن وە پارێزگاری بکە لە ئارامی مێشـــك و دڵ و دەروونت با هیچ کەس و شـــتێك نەتوانێت بیکات بەخاڵی لاوازت.

## بەشێکی دووڕوویی ئەوەیە هەموو کەسێك لێت ڕازی بێت!

لەوانەیە توشـــی ســەرســوڕمانبیت کاتێك پێت بڵێن مادام هەموو کەس لەتۆ ڕازییە کەسێکی (دووڕوویت) باشە لەخۆت دەپرسیت خراپەی کەســـت نەبووە و هیچی خراپیشـــت نەکردووە لەگەڵ هەمووان میهرەبانیت و دادپەروەر و دڵســـۆزیشـــی کەوایە بۆ هێشـــتان کەســـانێك هەن لەتۆ ڕازی نین لەبەرچی هێشـــتان گـازانـدەت لێ دەکـەن و بـەدوای خـاڵێکی بچوکدا دەگـەڕێن کـە نایدۆزنەوە یان بۆتی دروســـت دەکەن یانیش دەبن بە هەڵگێڕەرەوەی باشییەکانت.




ئەوە بزانە کەوا هەرگیز بەدوای ڕازیکردنی هەموو کەس مەبە لەخۆت چونکە ئەوە بەکەس ناکرێت و ئەســـتەمە, مرۆڤ لە ســـەرەتای بوونییەوە لەگەڵ یەکتری ناکۆك بووە و هەمیشـــە لە

کێبڕکێدا بووه و کەســـی بەرامبەری بە هەڕەشــه زانیوه لەســـەر بەرژەوەندییە تەسکەکانی خۆی و بەدوای لێدانی زەبرەوە بووە نە ك بۆ تۆڵەکردنەوە بەڵکو لەپێناوی ســـەرکەوتنی خۆی ئامادەیە کەسێکی تر بخات ئەگەرچی کەسی دڵسۆز و بەخشندەی خۆشی بن ئەوانە ئەو کەسانەن کە هەرگیز نابن بەخۆیان.

ئەگەر بتەوێ هەموو کەس لەخۆت ڕازیکەیت بەبێ ئەملا و ئەولا دەبێت کەسێکی (دووڕووبیت) بەشێوەیەکی تر ئەوکاتەی خۆتنیت دەتوانیت هەمووکەس لەخۆت ڕازیکەیت, بەخشـــندە و لێبوردەبە دڵسـۆز و لێزانبە میهرەبان و دادپەروەربە هێشـتان کەسـانێك هەن دژن و پێیان وایە ئەوانە قسـەی گەورەن, مەرج نییە بە قسـە پێتی بڵێن بەڵکو پیشانی دەدەن کە ئەوانە هیچیان لەلای ئەو ئەخلاق نین بەڵکو دان بە ئەخلاقی بونیاندا نانێت چاکە و خراپە جیاوازی نییە لای ئەو تەنها ئەوە گرینگە کە بەرژەوەندییەکانی ئەو چین و چۆن دێنەدی, کات بەوە مەکوژە کە بتەوێت هەمووان وەك تۆ بیربکەنە وە خەم لەوە مەخۆ کە ڕەخنەگری درۆینەت زۆرە چونکە کێشـــە کەی ئەوان لەگەڵ بیکردنەوە و ســـەرکەوتنەکانی تۆدا نییە بەڵکو لەگەڵ خۆیان و لەگەڵ خودی تۆدا کێشـــەیان هەیە گیرۆدەی ئەو بەخیلیەن کە لەناخیاندایە بۆیە دژبەری تۆن.

کارێك کە ئەستەم بێت ئەوەیە هەمووان لێت ڕازیبن بەبێ ئەوەی (دووڕووبیت) چونکـە ئـەگـەر هـەمووان لـەگـەڵـت بوون کـەواتـا لەگەڵ ئەو کەســـەی کە خراپ بیر دەکاتەوە تۆش خراپ بیر دە کەیتەوە بۆیە تۆی بە دڵە و لەگەڵ ئەو کەسەشی باش بیر دەکاتەوە باش بیر دەکەیتەوە, لە ڕاســـتیدا ناکرێت ئەو دووتاییە لەهەر کە سـێکدا بوونـی هەبێت بەڵکو بەو شـێوەیەی کە خۆی بۆی دەژی و دەیەوێ بابژی لە چوارچێوەی سـنوری خۆیدا بەبێ زیان گەیاندن بەهیچ کەسـێك نەوەك ڕازیکردنی هەموو کەسـێك و لەو پێناوەدا کاتی ژینی بەفیڕۆ بدات.

وەك ئاشـکرایە هەموو کەسـێك وەك یەك بیرناکاتەوە و هەموو کە سـێك هەمان چەشـن لە بیر و باوەڕ و ڕێچکەی ژیانی نییە بەڵکو

هەر كۆمەڵە كەسێك و دابەشبوونە بەسەر چەند گروپێكی جیاجیا و لەناو گروپەكانیشدا دووفاقی و بگرە هەر كەسە و جۆرێك بیر دەكاتەوە, هەموو ئەوانەش یەك هۆكاریان هەیە ئەویش شێوازی تێگەیشتن و لێكدانەوە و تەفسیری بابەتەكانە لە هزری هەر كە سێكدا, هەر كەسە و جیاواز لێكدانەوە دەكات بۆ بابەتێك و نەرمی پێ دەنوێنێت و بە شێوەی خۆی ڕاڤەی دەكات لە هزری خۆیدا ئە وەش وادەكات دژبەر و هاندەر دروستببێت, بۆ نموونە هیچ خراپە یەك نییە لە گرتنەبەری ڕێكاری یاسایی بەرامبەر بەو كەسانەی مامەڵە دەكەن بە مادده (سركەر و بێهۆشكەرەكان و....هتد) بەڵام لای ئەو كەسەی كە مامەڵە بەو ماددانەوە دەكەن یانیش بەشێكی ئەوانەی كە بەكارهێنەرین ئەو ڕێگرییە كارێكی ناڕەوایە و ڕێگرە بۆ ئەوان یان ئەو كەسەی كە قسەیەكی چاك دەكات و بەهە ڵە دەگات بە خەڵكی و بەشێكی لێی تێدەگەن و بەشێكیش نایانەوێت تێبگەن بەشێكیش هەڵە لێكدانەوەی بۆ دەكات لێرەوە بەرەی هاندەر و دژبەر دێتە كایەوە بۆیە كات بەوە بەفیڕۆ مەدە كە هەمووان لێت ڕازی ببن.

## ببە بە هەموو کەس بۆخۆت!

بەســـۆزبە و میهرەبانبە بەجۆرێك بگری هەرچی ئازارە لەکۆڵ خۆتی بکەیتەوە و بە فرمێســـکەکانت کۆتاییان پێ بێنە, کەســـێك ئەگەر بەهەست و سۆز و ویژدان نەبوو (مرۆڤ نییە) ,خراپترە لە بەرد, چونکە ئەوکاتەی مرۆڤ ئەو هەستانە لەدەست دەدات جگە لە ستەمکاری هیچ شتێکی تر لە دڵیدا جێگای بۆ نابێتەوە, هیچ کەسێك بێبەش نابێت لە چەشتنی ئازار بە لەدەستدانی شتێك یاخود کەسێك کە هیوای لەسەر هەڵچنیبێ مەگەر نەگات بەو تەمەنە و کەسێکی تر بێ هیوا بکات, چونکە ئەوە سروشتی ژیانە و هەر بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت.




ئەگەر هەرکەسێك و ئازیزێکی لەدەست بدایە و لەدوای ئەو ئیتر چۆکی دابدایە و سەری بنایەوە کەسێك نەدەما لەسەر زەوی و ژیانیش کۆتایی پێدە هات بۆیە وامەزانە هەر تۆ بەتەنیا خەمت هەیە و هەموان دڵخۆشـــن, نا..! هەر یەکە و خەمێکی هەیە کە بوەتە برین لە جە

ستەی هەروەك ئەو پەندە كوردیە باو و نایابەی كە دەڵێت( هە
ركەس بەدەردی خۆیەوە دەناڵێنیّ) بەڵام با واز لەو ناڵاندنە بێنین
و بێینەوە نێو ژیان و هەست بەوە بكەین كە خەریكە لەژیانماندا
روودەدات ئەگەر هەر بەو جۆرە بیربكەینەوە و ژیان بگوزەرێنین
و بیر لە هەموو باشییەكانی ژیان بكەینەوە و كار لەسەر خۆمان و
توانای خۆمان بكەین و درێژە بە كاروانی ژیان بدەین لەگەڵ
هەموو باشییەكانی خەمەكان وەلا دەنرێن و ئاسانتر تێدەپەڕن,
ژیان بریتییە لە (هێز و كۆڵنەدان و بڕوابەخۆبوون) ئەگەر ژیان
داببڕیت لەوانە كەسێكی (بێ هێز و دواكەوتوو و دەست بەتاڵ)ت
لێدەردەچێت و هەمیشە خەڵكی بەزەییان پێتدا دێتەوە, هەر شتێك لە
ژیانی تۆدا ڕوویدابێت بریتی نییە لە هەمووشت و ژیان زۆر
فراوانترە لەوە, خۆشەویستی خۆتبە و خۆتت خۆشبوێت ژیانت
جوانتر بكە و كۆتایی بەهەر شتێك بێنە كە دەبێتە ڕێگر
لەبەردەمت, مرۆڤبە و هەروەك مرۆڤێكی ئاسایی ژیان بگوزە
رێنە لەكاتی خەمەكان پشت بەخودا ببەستە و سوپاسی خودا بكە و
داوای دڵخۆشی لیّ بكە و لێی بپاڕێرەوە كە دڵخۆش و سەرفرازت
بكات سوپاسگوزاربە كە لەبیری نەكردوویت دەرگای ئاسمان
كراوەیە (إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللهِ يَسِيرٌ) (٧٠) (الحج) واتا: هەموو
شتێك لای خودا ئاسانە, دڵنیابە لەوەی ئارامی دەگەڕێتەوە بۆ نێو
سینە و دڵ و دەروونت تەنها ئەو كاتەی (سوپاسگوزاری خودا
دەبیت) نەوەك بە كات كوشتنت لە خەمخواردن و مانەوە لە
ڕابردوو هەست بە تەنیایی بكەیت و كاتەكانت لەدەست بدەیت, هە
ست بە ئازار بكە و بیچێژە بەڵام وامەكە بەتەواوی دەست بە
سەرتدا بگرێت و كۆنترۆڵت بكات چونكە ژیانی هەر یەكێك
بریتییە لەو ساتەی كە تێیدا دەژیت نەوەك ئەوەی كە بووە بە
ڕابردوو, ژیانیش بریتی نییە بەتەنها لە یەكێكیان بەڵكو خۆشی و
ناخۆشییەكان تەواوكەری یەكترن و درێژە پێدەری ئەو ساتانەن
كە تێیدا دەژیت, (تۆماس هاردی) شاعیر و نوسەر و ڕۆماننوسی
بەناوبانگی ئینگلیز لە یەكێك لە كۆپلە شیعرەكانی بەناوی (چیتر

پێکەوە نابین) دەڵێت: (هەرچەند ئازاری زۆر ســــەختە مەناڵێنە، زامی ئەندێشەو ئازارت بەزەردەخەنە داپۆشە).
خۆت کەسـێکی تەواوی و کەسـێکی پێگەیشـتووی تێگەیشـتوویت بناغەیەکی دروســــت لە ژیانتدا بنیادبنێ کە هێزی ئەوەت تێدا هەبێت لەســــەر پێیەکانت بوەســــتیت و باوەڕی تەواوت بەخۆت هەبێت کە دەتوانیت ســــەرکەوتووبیت و درێژە بە کاروانی ژیان بدەیت بەهەموو خۆشــــی و ناخۆشــــییەکانییەوە, مادام خودایەك بوونی هەیە هەموو شتێك ئاسانە تەنها متمانەت هەبێت.

## ڕێزگرتن بکە پێشەنگ لە ژیانت!

ڕێزگرتن هەمیشە دەستکەوتی زۆرە بە پێچەوانەی بێڕێزی کە نە ك هەر ســوودی نییە بگرە تووشــی زیانیشــت دەكات, ئەوەی دە تەوێ بە ڕێزگرتن دەتوانی بەدەستی بێنی پێچەوانەکەشی دوورت دەخـاتـەوە لـەوەی کـە دەتـەوێ پێی بگـەیت, دوور بکـەوە لـەوەی خۆت بەراوردی هیچ کەسێك بکەیت هیچ کەسێك نابێت بەتۆ تۆش نابیت بەهیچ کەس, بە تەواوی دژ بەو بەرەیەم کە دەڵێن (لەگەڵ کەسـی بێڕێز بێڕێزبە) نابێت ئاستی خۆت بۆ هیچ کەسێك بهێنیتە خوارەوە ,(دوەین جۆنســـن) ئـەکتـەری دیـاری وڵاتی ئـەمریکـا دەڵێت: (خۆت لە چوار کەس بەدوور بگرە ئەوەی درۆت لەگەڵ دەکات, ئەوەی ڕێزت ناگرێت, ئەوەی بەکارت دەهێنێت, ئەوەی دەتکەوێنێت) هەرچوار کەســەکەی (جۆنسـن) کە باسـیان دەکات دەگەڕێنەوە بۆ خاڵی دووەم کەســـێك کە درۆت لەگەڵ بکات و بە کارت بهێنێت بۆ بەرژەوەندی خۆی و پاشـــان بتکەوێنێت ڕێزی لێت نەگرتووە, کەســـێك ئەگەر ڕێزت بگرێت قەدرت بزانێت



هەرگیز بێڕێزیت بەرامبەر ناکات بەوەی کارێك بکات کە دژ بەتۆ بێت.
هەوڵدە لەو کەســـانە نزیك بیتەوە و خۆشـــەویســـتی خۆتیان بۆ دەربیڕیت کە بەڕێزەوە مامەڵە دەکەن و ڕێزت دەگرن ئەگەر کە سـانێك دەناسـی کە پێزانینیان هەیە بۆ چاکەکانت و ڕێزت دەگرن بەرامبەر بەوەی کە ڕێزیان دەگریت کەسێکی بەبەختیت گرینگیان پێبدە بۆ ئەوەی بەردەوامبن, ئەگەر کەســـانێکیش دەناســـیت کە گرینگیت پێ نادەن و ڕێز لەخۆت و هەســـتەکانت ناگرن لێیان بەدووربە لە هەر شـــوێن و پێگەیەك بن و هەرچەندێك پەیوەندیت لەگەڵیان بەهێزبێت چونکە ئەوکاتە نرخ و پێگە و کەســـایەتی خۆتت بۆ بەدەر دەکەوێت کە لەو کەســـانە بەدووربیت کە ڕێزت ناگرن, ســـەرچاوەی ڕاســـتەقینەی بەخت قەدەرە و دوای ئەو خۆتیت جگە لەو دوانە شـــتێك بوونی نییە بەناوی )بەخت) بۆیە وردبە لەوەی چۆن و کەی و لەگەڵ کێ مامەڵە دەکەیت, چونکە لاوانەوە بە بیانوی بەدبەختی هیچی پێ نییە بۆت.
ناتوانین خۆمان بدزینەوە لەو ڕاســتیەی کە هەر شــتێك بکەین ئە وەمان دێتەوە ڕێ, بەڕێزەوە مامەڵە بکە بەڕێزەوە مامەڵەت لەگەڵ دەکرێتەوە, کەسایەتی خۆت بپارێزە بە هەڵوێستەکانت کە بەڕێزە وە مامەڵە دەکەیت (بەهجەت یەحیا) هونەرمەندی کورد دەڵێت ( :ڕێز لـە نـاکـەس بگـریـت بریـنـدار دەبێـت بـەوەی کـەتۆ خـاوەنـی ڕێزیت) لە هەموو حاڵەتێك ڕێزگرتن بونیادنەرێکی بەهێزە بۆ کەسـایاتیت با هەڵوێسـتەکانت ببن بە نموونەیەك بۆ ئەوەی چاوت لێ بکرێت, نموونەیەکی چەند جوانە کەســـێك بەهۆی تۆوە فێری ڕێزگرتن بێـت و ڕێز لـەخۆت و لـە خـەڵکیش بگـرێـت گرینگـە لەگەڵ کەســێك بەڕێزەوە مامەڵە بکەیت کە بێڕێزە, دڵنیابە لەوەی پەشـــیمان دەبێتەوە لەهەر بێڕێزییەك کە کردبێتی بەرامبەرت ( ئەدێل) خانمە گۆرانیبێژی بەریتانی دەڵێت: (گرینگ نییە بەلامە وە تۆ سپی پێستی یان ڕەش پێستی, کورتی یا درێژی, قەڵەوی یا

لاوازی, دەوڵەمەندی یا هەژاری, ئەگەر ڕێزت گرتم منیش ڕێزت دەگرم).
ڕێزگرتن لە هاوسەرەکەت و یارمەتیدانی مانای لاوازی و ترسنۆکی تۆ نییە لەبەرامبەری وەك هەندێك كەس كە بە نەنگی لێکی دەدەنەوە ئەوە سەربەرزی و گەورەیی و هەستی بەرپرسیارییەتی تۆ نیشان دەدات کە هەماهەنگ بیت لەهەر پێویستییەك یارمەتی بدەیت و ڕێزی لێ بگریت ئەوە یارمەتیدەرێکی زۆر باشدەبێ بۆ منداڵەکانیشت چونکە منداڵەکان هەمیشە ئەوە دەکەن کە دەیبینن ڕێز لە هاوسەرەکەت بگرە و گرینگی بە هەستی منداڵەکانت بدە ئەو هەڵوێستە لەوانیشەوە دەبینیتەوە لە ئێستا و لە داهاتوش وەك ئەوەی مامۆستا (شەماڵ موفتی) بانگخوازی گەورەی کورد دەڵێت: (پیاوی ژیر وا لە هاوسەرەکەی دەکات کە خۆشی بوێت, بەڵام پیاوی گەمژە داوا لە هاوسەرەکەی دەکات کە خۆشی بوێت) دیارە لەئاینی ئیسلامیش زۆر گرینگی بەڕێزگرتن دراوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: (لەئێمەنیە، کەسێك ڕێز لەگەورە نەگرێت، وە سۆزو بەزەیی و میهرەبانی بۆ بچوك نەبێت).

# ژیانی تایبەتیت مەکە بە گشتی!

لە ژیاندا کۆمەڵە شـــتێك هەن تایبەتن ناکرێت وە هێڵی ســـورن بکرێن بەگشـــتی, لەوانە ژیانی تایبەتی هەریەکەمان تایبەتە بەخۆمان نە کەس بۆی هەیە بیزانێ و نە کەسیش ببینێ و باسی لێوە بکات, بەڵام لە هەموو ئەوانە خراپتر ئەوەیە خۆمان ئەو ژیانە تایبەتییە بەگشتی بکەین لەبری ئەوەی بۆخۆمان بژین بۆ خەڵکی بژین, ڕەفتار و خووەکانمان لە چوارچێوەی حەز و ویستی خەڵکی بێت و بۆ ژیانی خۆمان ئەوە بڕیار بدەین ئەوە بپۆشین ئەوە بخۆین و سەردانی ئەو شوێنە بکەین کە خەڵکی لە ئێمەیان دەوێ, تەمەن زۆر لەوە کورتترە کە بیری لێ دەکەینەوە ئەمڕۆ کارێك بکە سبەی لێی پەشیمان نەبیتەوە.




ناکرێ بۆخەڵکی بژین و تایبەتمەندییە کەسییەکانمان پیشانی کەسانی تر بدرێت, بەتایبەت ئەوەی ئێستا کە هەیە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە هیچ سەردەمێکدا نەبووە بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ سنورێك کەسانێك دێن و ژیانی تایبەتی خۆیان دەکەن بەگشتی ئەوە پێش ئەوەی دەستدرێژی بێت بۆ سەر مافی خۆی دەستدرێژی کردنە سەر مافی تاکەکەسی هەر تاکێکە, کۆمەڵە کردار و گوفتارێکی ناشایستە بە خێزان و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان

ئەنجامدەدرێن, کە ئاگاداریش دەکرێنەوە لەســـەر ئەو ئاکارە بێ هیچ شـــەرمێك دەڵێن ( ژیانی تایبەتی خۆمە) نەخێر ئەوە ژیانی تایبەتی هەر هەموومانە لەبەر ئەوەی ژیانی تایبەتی باســـێکی جیاوازە تەنها لە چوارچێوەی خۆت و خێزان و هەندێك کاتدا هاوڕێ و خزم و دۆستەکانتە, هیچ کەس بۆی نییە پرسیاری لێوە بکات و چاودێری بکات بەڵام ئەو کاتەی ئەو ژیانە تایبەتییە دە کەیت بە ژیانی گشتی و دێتە نێو ماڵی هەریەکێکمانەوە سنورەکان دەبەزێنی, منداڵێك کە هێشـــتان درك بە چاکە و خراپەکان ناکات تاوانی چییە گوێ لەو قســانە بگرێت کە شــەرمە لەهەر شــوێنێك باس بکرێت ئاخەر ئەو کەســانە بیر لەوە ناکەنەوە دواتر کەســانی تر ئەو ڕەفتارانە دووبارە دەکەنەوە.

چی شتێك دەبێت لەوە خراپتربێت کەسانێك بەهۆی تۆوە تووشی لەڕێلادان و ســـەرلێشـــێواوی و ڕەفتاری خراپ ببن, ئاگاداری ژیانی تایبەتیتان بن ئەمڕۆ کارێك بکەن ســـبەی ســـەربەرزبن پێوەی, چونکە لەوانەیە بەیانی دەرفەتی ئەوەت نەبێت چاکیان بکەیتەوە, ژیانی تایبەتیت بپارێزە.!!

## نزیکترین کەسی خۆتبە!

نزیکترین کەس لەخۆت با هەر خۆتبیت پێش ئەوەی خەڵکی زیاتر لـە خۆت نزیکبن لێتـەوە, لـەبـەر ئـەوەی هیچ کـەس وەك خۆت نازانێت چیت لە ناخدایە و چیت دەوێت سـەرەتاییترین ڕێگا بۆ ئە وەی خۆت بناســـیت ئەوەیە لەگەڵ خۆتدا بدوێیت بزانیت چیت دەوێت و چی شتێك ژیانت بەرەو باشی دەبات چی شتێکیش بەرەو خراپی دەبات وردتر بیڵێم ئەوەیە باشــە و خراپەکانت لەیەکتر جیا بکـەیتـەوە بزانیـت چی دەکـەیـت و بـەرەو کوێ دەچیت ئـەوکـات کەســـێکی پێگەیشـــتویت و لەخۆتەوە نزیکی, ئەگەر هەموو ئەو تـایبـەتمـەنـدی و پرس و بـابـەتـە خودییـە تـایبـەتییـانـەی کـە خۆت



درکت پێی کردووە جگە لەخۆت کەسانی تریش دەیزانن بزانە لە دۆخێکی مەترسیداردایت, هەرگیز بیرۆکەکانت لای هەموو کەس باس مەکە بۆ ئەوەی نەپێکرێیت, ئەگەر وای دابنێیت کەســـانێك هەن زیاتر لەخۆت درك بەوە دەکەن چیت دەوێت ئەوکات تۆ

مافی خۆتت پێشـــێل کردووە لەبەر ئەوەی ئەگەر خۆت نەتوانیت مافی ئەوە بەخۆت بدەیت بزانیت ناخ و هەستەکانت چیان پێویستە دڵنیابە لەوەی هیچ کەسێکیش ناتوانێت ئەوە بکات.
ئەگەر دەتەوێت ببیت بەو کەسـەی کە خۆت دەتەوێت هەستەکانت بپارێزە و بۆ هەموو کەس دەریان مەبڕە بۆ کەســـانێك نەبێت کە گرینگیان پێ بدات با نەبیتە یارییەك و بە ئاســـانی هەرکات بیانەوێ مامەڵەیەکی جیاوازت لەگەڵ بکەن بە پێچەوانەوە دەبیت بەو کەســـەی کە دەیانەوێ ببیت پێی, ئەوە غەمبارم دەکات کە دەبینم کەسانێك هەن بەهۆی فشاری بەرامبەرەوە ناچارن ببن بەو کەسـەی ئەوان دەیانەوێت ببێت پێی نەوەك ئەوەی خۆی دەیەوێت, بۆیە هەمیشە با بابەتە کەسییە هەستیارەکانت با نهێنی بێت لەنێوان خۆت و خودای گەورەدا دواتر قســـەی خەڵکی وادەکات وزەی پێویســـتت نەبێت بۆ بەردەوامیدان بەو ڕێگایەی گرتووتتەبەر و پێویستت بە کاتی زیاتر و وزەی زیاترە بۆ دەربازبوون لەو قسانە , لەگەڵ خۆتدا بە خۆتت خۆشبوێت بۆ ئەوەی هەست بە کەمی نە کەیت لەناخی خۆتدا, با ســـنورێکی قایم هەبێت لەنێوان خۆت و کەسانی تر بۆ ئەوەی نەتوانن دەست وەربدەنە نێو ژیانت و بڕیار لەجیاتی تۆ بدەن, سنوری تۆ هێڵی سورە وابکە کەس نەتوانێت یە ك هەنگاویش بێتە پێشـــەوە چونکە هیچ کەس باجی ئەو خراپەیە نادات جگە لەخۆت.
هەر کەس لە ئێمە زیاتر لەوەی پێویستی بە خەڵکی بێت پێویستی بە کەس و کاربێت پێویسـتی بەخۆیەتی هەریەك لە ئێمە ئەوەندەی پێویستە لە ناخ و هەستەکانمان نزیك بینەوە ئەوەندە پێویستمان بە وە نییە لە خەڵکی نزیك بینەوە, بۆیە واز لە هەموو ئەو شـتانە بێنە کە وادەکەن دووبکەویتەوە لەخۆت ڕۆژانە هەفتانە هیچ نەبێت بە لایەنی کەم مانگی جارێك بەخۆداچونەوەیەك بەخۆتدا بکە بزانە ئەوەی دەیکەیت و دەیڵێیت هەر ئەوەیە کە دەتەوێت هەر ئەوەیە کە هیوات بۆی دەخواسـت و کارت بۆی دەکرد, هێشـتان درەنگ نەبووە ئەگەر وانییە ئەمڕۆ نزیکترین دەرفەتە لەدەســـتی مەدە

ڕێگاکەت بە بەرنامەڕێژییەوە دیاری بکە ڕەنگە ئەو دەرفەتەی ئێستا بۆت دەرەخسێت بۆ بەیانی لەدەستی بدەیت.

## خۆشی وەرگرتن تایبەتە بە تەمەنی گەنجی؟

ئەوە بیرکردنەوەیەکی باو و خراپە لەنێو بەشـــێکی گەنجاندا بووە بە (مۆتەکە) بۆ دەبێ لە ســـەردەمی گەنجی و لاویدا هەڵپەی خۆشـــی بگاتە لوتکە و دوایی ســەردەمی خۆشـــی نامێنێ بەبڕوای ئەو ئیتر کە لەو تەمەنە تێپەڕی کرد وادەزانێ خۆشـــییەکان کۆتاییان پێدێت و سـەختی زۆر دەبینن, لە ترسـی ئەوەشـە خۆیان بەدوادێخن و خەریکی کات بەســـەربردنن بێ ئاگا لەوەی هیچ شـتێك بۆی حاسـڵ نەبووە بەڵکە هەر لەشـوێنی خۆی داتەپیوە, لە پێشـینان پەندێکی عەقڵانیان بۆ کاتێکی وا دارِشـتووە بە گونجاوی دەزانم لێرە ئاماژەی پێ بدەم کە دەڵێت: ( پێشی تای بەڕی بەخۆت دادە) پەندێکی جوان و مانادارى کوردەوارییە کە ڕێك دەڵێی بۆ ئەو باســە کراوە, مەبەســت لەوە هەر ئەوە نییە کە پێشـــی ئەوەی ســـەرماگرتووبیت پێخەفێك بەخۆت دابدەیت نا زۆر فراوانترە لە




وە, ئەگەر بیبەســـتینەوە بەو باســـەوە ئەوا پێمان دەڵێت ئەی گەنج بەر لەوەی دەســـتەکانت ســـیس بن و لاواز ببن کار بکە داهاتوو بۆخۆت مسـۆگەر بکە خۆشـییەکان لەوێ پڕ چێژترن نەوەك لێرە,

تەمەنی گەنجی تەمەنی کارکردن و ئەرك و ماندووبوونە نەوەك تەنها کورتی بکەیتەوە لە چەند شـتێکی تر کە کات کوشـتنی تۆن چێژ بینین لە سروشت و خۆشییەکانی دونیا بەتەنها بۆ گەنجەکان نییە لەهەر تەمەنێکبیت دەتوانی ئەوە بکەیت, بەڵام پێویسـتی بە دووربینییە لەوەی باجەکەی لە تەمەنێکی تر نەدەیت کە دەسـتە کانت لە توانا کەوتوون و ماسـولکەکانت توانای کارکردنی چڕ و بەردەوامیان نییە.

ئەمڕۆ ماندووبە و کاربکە و پەرە بە هۆشمەندی خۆت بدە و هەلی سـەرخسـتن و فێربوون لەخۆتدا پەرە پێ بدە, بەیانی بەهۆی نەبوونی هۆشـمەندی و تواناکانی ئێسـتات ئاسـودەبە, کارکردن و ڕەنج کێشـانی ئەمڕۆت سـەربەرزی و خۆشـبەختی سـبەی بە دواوەیە.

گەنجی ئەو تەمەنەیە کە خۆتی تێدا بونیاد دەنێیت بەو پێیەی خەریکی وەرگرتنی ئەزموونی بۆیە چاوەڕێی ئەوە مەبە ڕووبەڕووی هیچ پێچی و ئاسـتەنگێك نەبییەوە, سـەروەری مرۆڤایەتی و خۆشـەویسـتمان (محمد) (ﷺ) پێمان دە فەرموێت:(ئاگاداری گەنجیت بە پێش پیری).

تەمەنی مرۆڤ تا ئەو ساتەی کۆتایی پێدێت لەهەر ساڵێکی ژیانی دابێت گەورەبێت یان بچوك بە ئەزموندا تێپەڕدەبێت لەتاقی کردنەوەی هەر شـتێکی نوێدا ئەزموونێك دەبینێت بۆیە لەپاڵ وەرگرتنی چێژ لە خۆشییەکانی ژیان ئەزموونەکانیش تاقی بکەرە وە و هەوڵی داهێنەرانە بدە لەخۆتدا بۆ ئەوەی چێژ ببینی لەژیان ئەوە باشـترە نەوەك کەسـێکی ڕواڵەتی دڵخۆشـبی و هەمیشـە لە گەڕان و سـەیراندابیت بێ سـڵەمینەوە لەوەی کۆتاییەك بۆ ئەوە هەیە و پێویستت بە کۆمەڵە شتێکی ترە نابێت فەرامۆشیان بکەیت لەبەر خۆشـییەکی کاتی تەمەنی گەنجیت لەبیر بکەیت چونکە تەمەنی گەنجی گەنجینەیەکە لەوەیە بە خۆماندووکردنت لەو تەمەنە خۆشـییەك بەدەسـت بێنی تا ئەبەد بە ئاسـوودەیی ژیان بگوزەرێنی.

هەڵە تێگەیشـــتن لە تەمەنی گەنجیت باجی گەورەت پێدەدات بۆیە دەبێت فێربیت!
دونیا دەشـتێکی پان و بەرین و لێژاییەك نییە بتخزێنێتە نێو دونیای خەون و خەیاڵەکانت, ئەگەر بە بەرزی و نزمی تێپەڕ بویت ئەگەر توشـــی نارەحەتی بویت, دواجار ئەگەر بە ورە بەرزی و بڕوا بەخۆبوونەوە بەرەو پێش چویت هەسـتی سـەرکەوتنت زاڵ کرد بەسەر بیانوە بێ نرخەکانت دەگەیت بەوەی بڕوات پێی هەیە کە پێی دەگەیت!.
(دان لوك) بە ڕەگەز (چین)ی و بازرگانێکی شـــاری کۆڤەرڤی کەنەدایە لە ســـەرەتاکانی تەمەنی (١٤) کۆمپانیای یەك لە دوای یەکی دانا و شـــکســـتی هێنا بەبڕوا بەخۆبوونەوە بەرەوپێش چوو دواجار ئێســـتا بازرگان و ملیاردێرە لە چەندین بواری جیا کار دەکات و لەلایەن کەنەدا پۆستەوە ساڵی (٢٠١٨) خەڵاتی باشترین تاکفرۆشـــی ئۆنلاینی پێبەخشـــرا وتەیەکی بەناوبانگی هەیە دەڵێت ‘‘ســـەرکەوتن کاتێك بەدەســـت دێت کەخەونەکانت گەورەتربن لە بیانوەکانت" بیانوی کۆتایی هاتنی خۆشـــییەکانت بیانوویەکی بێ نرخە چونکە ژیان هەم خۆشـــی تێدایە و هەمیش ناخۆشـــی و ئەوە تایبەت نییە بەهیچ تەمەنێکەوە.

## پەروەردەی باش کلتوری باش بونیاد دەنێت!

پەروەردەی دروســـت بەجۆرێك کار دەکاتە ســـەر کۆمەڵگا کە دە کرێت هێندە پشت بەستووبیت پێیەوە خەمی داهاتوو لەبیر بکەیت بەوەی دەخرێتە دەســـتێك کە جێگای متمانەی ڕاســـتەقینەیە و دەتوانێت وڵات بەرەو پێشـــەوە ببات و بەردەوامیش بەو ڕێگایە بدات کە خۆی پێیدا هاتووە بە جۆرێکی باشـــتر لەبری ئەوەی خراپی بکات و تاکی ســـەرکردەی تێدا پەروەردە بووبێت کە لە




داهێنانی بەردەوام دابن لە هەموو کایە جیاوازەکان, مرۆڤ ئەو کاتە ئاســـوودەیی دەروون بەدەســـت دێنێت کە دەبینێت ڕەنجی ماندووبوونی چەند ســـاڵەی پەروەردەکردنی نەوەکانی داهاتووی بەفیڕۆ نەچوە و وەك چرایەك دەگەشێنەوە.
پێدانی هێزی ژیان و کەســـایەتییەکی بەهێز لە ئەرکە هەرە گرینگەکانی ئەو کەسانەیە کە ئەرکی پەروەردەیان لەسەر شانە,

دوو بژاردەت لەبەردەمە یان ئەوەتا مرۆڤێکی خاوەن کەسایەتی تایبەتمەند و دەروون دروست دەکەیت یانیش ئەوەتا مرۆڤێکی دەبەنگ ئاسا و پەککەوتە و ڕۆبۆت ئاسای ڕووکەش زیندووی ئاکار و ڕۆح مردوو دروست دەکەیت لە خاڵی یەکەم ئەگەری باش هەیە کە خۆی ڕێچکەی ژیانی خۆی بدۆزێتەوە و درێژە بەو ڕێبازە پەروەردەییە دروستە بدات کە پێی بەخشراوە و خۆی بدۆزێتەوە, بەڵام لە خاڵی دووەم تەنانەت بەجۆرێك ئەو کە سە تووشی سەرلێشێواوی دەبێت کە جگە لە ژیانی خۆی ژیانی چەندین کەسی تریش بەلاڕێدا دەبات و زیان بە کۆمەڵگا دەگەیەنێت بۆیە پەروەردە بریتی نییە لە خۆ ئامادەکردن بۆ ژیان پەروەردە خودی ژیانە و سەرتاپای ژیانی مرۆڤ پەروەردەیە و ئەزموونە, ئەزموونێکی باش ببەخشەوە و سوود لە ئەزموونە باش و خراپەکان وەربگرە و جیاکاری دروست بکە لەنێوانیان.
ئەگەر دایك یان باوکی یانیش مامۆستایەکی, ئەگەر کاربەدەستی یان بڕیاربەدەست بەرپرسیارییەتییەکی هێندە مەزنت لەسەر شانە کانت هەڵگرتووە کە دەکرێت ببیت بە هۆکاری گەشانەوەی وڵات لەداهاتوو بەو خزمەتەی کە دەیکەیت لە پیشەکەتدا و بەباشی بەرپرسیارییەتییەکەت بەجێ دەگەیەنی بۆیە کار بۆ پە روەردەیەکی دروست بکە لەپێناوی پاراستنی شوناس و کەسایەتی دەوڵەت و هاونیشتیمانیانت لەپێناوی کلتوری نیشتیمان و بەرژە وەندییە گشتییەکان, لەهەر شوێنێکی کە ئەم باسە دەخوێنیتەوە نموونەیەك بە بۆ پەروەردەی دروست.
ئەگەر لەهەر شوێنێکی سەر ئەم زەویەیت و خەمی ئەوەتە کەسایەتی خۆت بپارێزی سوود لە ئامۆژگارییەکانی بەخێوکارە کەت و فێرکارەکەت وەربگرە و بیریان لێ بکەرەوە بەوەی چۆن بتوانیت بەباشی بەرپرسیارییەتی خۆت بەجێ بگەیەنی و ڕەنجی چەند ساڵەیان هەروا بە ئاسانی بەفیڕۆ نەدەیت ئەوەش لەپێناوی هیچ کەسێك نا پێش هەموو کەس بۆ ئەوەیە ببیت بەخۆت.

کە باس لەو کەســە دەکەین و دەڵێین ببە بەخۆت ئەوە پێش هەموو شت بەرپرسیارییەتییە بەرپرسیارییەتیش لە پەروەردەدایە و هەر لە پەروەردەوەش ســەرهەڵدەدات و پێویســتی بە بناغە هەیە, بۆیە کەســێك کە پەروەردەیەکی باشــی وەرنەگرتبێت ئەوەش ناتوانێت کە ببێت بەخۆی و پارێزگاری لە زمان و نەتەوە و کلتورەکەی بکات, بۆیە ببە بەخۆت بۆ ئەوەی بناغەیەکی باش بونیاد بنێیت و جێگای متمانەبی بۆ پێســپاردنی بەرپرســیارییەتی کە دەخرێتە ئە ســتۆت و لەو ئاســتە بەرزەدابی, ئەوە یارمەتیدەرت دەبێت و زۆربەی دەرگا داخراوەکان بەڕووتدا دەکاتەوە و وات لێدەکات کە خۆت بناســیت و خۆت بدۆزیتەوە لەنێو ئەو هەموو کەســە دووبارەیەی دەورووبەرت کە نەیانتوانیوە ســەرکەوتووبن لەوەی ببن بەخۆیان و دووبارەی هیچ کەسێك نەبن.

کلتوری خراپ ســەرەنجامی پەروەردەی خراپە و دواجار خودی کەســەکانە کە چۆن بیر دەکەنەوە و تێڕامانیان ســەبارەت بە بارودۆخەکان وادەکات ڕێگایەك بکاتەوە و کۆمەڵە کەســێکیش لەگەڵ خۆی ببات و دەکرێت بەپێی کات شـێوانێك دروسـت بکات لەو سیستەمە دابونەریت و کلتورەی کە هەیە بۆیە هیچ کەسێك بە کەم ســەیر مەکەن تەنانەت یەك کەس دەتوانێت ڕێبازی ژیانی کەســانێکی زۆر بگۆڕێت چی بە خراپ و چی بەباش, هەرچی شـوێنکەوتوانی ڕێگای چەوتن زۆر بە ئاســانی پێیدا دەڕۆن بەبێ دوودڵی چونکە نەك هیچ کات نایانەوێت ببن بەخۆیان و لەوپێناوە ئەو ڕێگایە بگرنەبەر بەڵکو بۆ ئەوەی ئەوە بســەلمێنن کە خۆیان هیچ نین و بە کۆیلە ئاسایی وەك ئەوەی توشی کوێرەوەری بووبن و بژی بژی و دروشــمە باق و بریقەدارەکانیان دەڵێنەوە, ئەوەش ڕێگایەکی چەوتە و دەســتکەوتی نییە جگە لەوەی دەکرێت ژیانی نەوەیەك بەفیڕۆ بدات کە کاریگەری هێندە زۆربێت بە ســەدەیەك نەوەکانی دوای خۆیان باجەکەی بدەن تا دێتەوە ئەو خاڵەی کە دەســتپێکی ئەو نالەبارییەبوو, هەرچی بکرێت و نەکرێت کلتور و بەها بەرز و پیرۆزەکان ناپارێزرێن بە کەســانێك کە لە وەهم

دەژین تەنانەت توانای کۆنترۆڵکردنی خۆیان نییە و سوودیان بۆخۆیان نییە چ جای ئەوەی بەرپرسیارییەتیان سپاردە بکرێت, بۆیە پێش ئەوەی توشی هەرشتێك بین کار لەسەر تاك بە تاکی خەڵکی لە پەروەردەوە دەست پێ بکەین و بەیەکەوە پارێزگاری لێ بکەین کە جوانییەکانی تێدا کۆبۆتەوە و بەر لە هەر ڕووداوێکی نەخوازراو بتوانین پەی پێ بگرین.

## پەیوەندی خۆت و ئازیزانت بپارێزە!

ژیانی مرۆڤ تایبەتمەندە و جیایە لەهەر بونەوەرێکی تری سەرزە مین خودای گەورە سروشتێکی تایبەتی بەهەریەك لە مرۆڤەکان بەخشیوە ئەویش ئەوەیە ناتوانێت تا کۆتایی بەتەنیایی بژیت بەڵکو ئەوەی جوانی بەخشیوە بە ژیانی مرۆڤ ئەو پەیوەندییەیە کە هەیەتی لەگەڵ خۆی و دەوروبەری, پارێزگاری کردن لە پە



یوەندی نێوان خۆت و ئازیزانت قەدرگران و سەنگینت دەکات, ئێمەی مرۆڤ لەپای چی خۆشەویستی و ئاشتی لەنێوان یەکدیدا بڵاو نەکەینەوە بە درێژایی ژیان جیل دوای جیل شوێنی یەکتریان

گرتۆتەوە, بەڵام سەیرەکە لەوەدایە نەتوانراوە بە گشتی هەموو مرۆڤەکان پارێزگاری بکەن لە بڵاوکردنەوەی ئاشتی و ئازادی و پێکەوە ژیان لەبری ئەوە بەشێکی مرۆڤایەتی شەڕ و ترس و نادادیان بڵاو کردۆتەوە ئەوەی لەوبارەیەوە سوودمەندە تەنها ئەوانەن بەژدارن لە بڵاوکردنەوەی ئاشتی و ئازادی و پێکەوە ژیان چونکە وەك لە پێشینانەوە وتراوە (مێژوو ڕەحم بە کەس ناکات) خراپتر لەوەی لەدوای خۆمان چی ئاکار و ڕەفتارێك بەجێ دێڵین ئەوەیە بەرپرسیارین بەرامبەر هەموو ئەو شتانەی کردوومانن لە دادگای خودای گەورە چی شتێك دەبێت لەوە خراپتربێت ڕوومان نەبێت سەربەرز بکەینەوە سەیری ئەوکارانە بکەین بە درێژایی ژیان کردوومانن لە هەموو ئەوانە خراپتر سزاکەیەتی لەبەردەم دادگای خودای گەورە لەو ڕۆژەدا هیچ کەس بە هاناتەوە نایێ جگە لە ئاکار و گوفتارە باشەکان.

کەسێکی سادە و ساکاربە بەژداربە لە بڵاوکردنەوەی ئاشتی بە سەلامکردن هەروەك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی ( أفشوا السلام بينكم تحابوا) ( صحيح الجامع لشيخ الالباني رحمه الله - ١٠٨٦) واتا سەلام بکەن لە نێوان یەکتریدا، ئەگەر واتان کرد ئەوا خۆشەویست ئەبن لەلای یەکتری, بەوە خۆشەویست دەبیت و تووشی لوتبەرزی نابیت چونکە بەشێکی ئەو خۆ دوورگرتنە لەخەڵك و ئازیزانت یان ئەوەیە خۆت بە کەمتر لەوان دەبینی و ئەوان لەخۆت بەرزتر دەبینی, یانیش لەتبەرز و گزگڵی! کەسایەتیت بەوە بەهێز و سەنگین بکە تێکەڵاوی لەگەڵ خەڵکی و بەژداری خۆشی و ناخۆشییەکانیان بکەیت و هاوبەشیان لەگەڵ بکەیت بە ڕەچاوکردنی سنورە تایبەتمەندەکان.

پاراستنی پەیوەندی خۆت و ئازیزانت هەر تەنها بریتی نییە لەوەی کە چیت پێ دەڵێت و چیان پێ دەڵێیت, لە گوفتاردا هەمووان دەتوانن گوفتار شیرن بن بەڵام ڕاستگۆ ئەو کەسەیە کە بەکردار دەری دەخات کە دڵسۆزە و خۆشی دەوێیت, زۆرجار کەسانێك

دەبینین و ڕووبەڕوویان دەبینەوە و ڕەنگە لەژیانی زۆربەمان هەبن کە قسەخۆش و ڕووگەشن بەرامبەرمان و زمانێکی پاراویان هەیە لە مەرایی کردن بۆمان و لە دواوە کارێك دەکەن کە پێچەوانەی ئەوەیە کە دەیڵێن ئەوەش بەپێی کات وادەکات متمانەی دەورووبەریان لەدەست بدەن بۆیە هەمیشە ئەوە بڵێ کە دەیکەیت بۆ ئەوەی پارێزگاری لە کەسایەتی خۆت و پەیوەندی خۆت و ئازیزانت بکەیت.

## خۆت خاوەنی خۆتبە!

دەزانم خەونت هەیە دەزانم حەز دەکەی بگەی بەخەونەکانت ئاخەر سروشتی مرۆڤی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو وایە هەمیشە ئایدۆلۆژیایەك بۆخۆی لە مێشکیدا دروست دەکات دەیەوێت بەو ئایدۆلۆژیا خەیاڵییە بگات کە لە مێشکیدا هاتوچۆ دەکات بیری لێ دەکاتەوە هەمیشە لە خەیاڵیدایە بەدڵنیایی هەموو مرۆڤێکی سەرکەوتوو خەونی هەیە و ئایدۆلۆژیایەك لەپشتیەوەیە بۆ ئەوەی لەناو نەچێت بەردەوامی پێبدە هەتا نەبێت بەڕابردوو و حەسرەتی بۆ بکێشی بۆ نموونە ئەو کاتەی کە منداڵ لە هەندێك لە کۆمەڵگا دواکەوتووەکان دەنێردرێتە قوتابخانە بە شێوەیەکی باو و ئۆتۆماتیکی بەشێکیان بەرەو ئاڕاستەیەك دەبردرێن لەلایەن کەسانی دەوروبەریەوە ئەو کەسانە دەکرێت دایك و باوك بن یان خزم و دراوسێ یان هاوڕێ بن, ئەو ئاڕاستەیە دەکرێت



ئاڕاســـتەیەکی باشــبێ بەڵام ڕەنگە ئەوە دووربێ لە هیواو ئارەزووی ئەو کەســە بۆیە بەپێی گەورەبوونی کەســەکە دەبینێت کە لێی ســـەرکەوتوو نابێت! بۆ؟ ئەو منداڵە بەدوای خەونی کە سانێکەوە بووە بە درێژایی ژیانی کە هەمیشە سەرکوتی ئایدۆلۆژیا کەســـییەکەی دەکەن ئەو هیوایەی کە هەڵی بژاردووە وەك ســـە ڕابێك لە دوورەوە ســـەیری دەکات خەیاڵی هەر لای ئەوەیە کە چۆن بگات بەو خەونەی, ئەو ئایدۆلۆژیایەی کە بۆی ئاڕاســـتە کراوە وەك ڕێگرێك دەبینێت لەپێشــی بۆیە مێشکی لای ئەوەیە ئە وەی کە دەبوو ببێ نەبوو درك بە هەڵەکەی دەکات, لێرەدا ئەوەی جێگای بایەخە ئەوەیە دەبێ بڵێین ببە خاوەنی خۆت ئایدۆلۆژیا و ئامانجێك بۆخۆت دروســـت بکە, لەهەمان کاتیش پرس و ڕاوێژ بەهەند وەربگرە و کاری لەســەر بکەو هەوڵی بۆبدە و بەردەوامی پێ بدە لەبەر ئەوەی دەتەوێ خۆتبی نەوەك نمایشــی کەســانی تر بکەی بەو شــێوەی لە هەیکەل و ڕوونما تۆ ببینن لەناوەوە کەســـێکی تربی و لە کرداردا ئەو کارە نەفرەتییەت لێ ببینن کە خەونت پێوە نەبینیوە.

ئەگەر بێتوو لە ســـەرەتاوە شـــتەکان پێچەوانە بکەینەوە بۆ وێنە کاتێك دەچیتە قوتابخانەو دەخوێنی بەپێی گەورەبونت و تێگەیشـــتنت لە واقع خەون بە شـــتێکەوە دەبینیت حەز دەکەیت شـــتێکت لێ دەربچێت حەزت لە پســـپۆڕییەکە ئەو پســـپۆڕییەت هەڵبژاردووە کە خۆت خەونی پێوە دەبینیت نەك ئەوەی بووە بە (بنێشتە خۆشەی سەر زاری خەڵکی) دەکرێت کاری لەسەر بکەی و هەوڵی بۆ بدەی دواجار دەگەی بەوەی کە دەتویســـت و ســـە رکەوتوو دەبیت لێی لەبەر ئەوەی سەرەتا خەونی تۆبووە دواتر بە پڕ هیواو وززەوە کارت بۆی کردووە نەوەك وەك ئەوەی بەزۆر پێتی بکەن بیکەیت, بەشێك لە نهێنی گەیشتن بە خەونەکانت ئەوەیە خەونەکان بیرۆکەی خۆتبن.

سێ شت لەبیر مەکە کە کەسێکی خەون و ئامانجت هەیە:-

- بەربەستەکانی پێشت بشکێنە و ڕووبەڕووی ناڕەحەتییەکان ببە وە.
- هەوڵی خۆت بدە و بەهێزبە.
- بەردەوامبە لە بەرەو پێشچوون سەرەڕای ئاستەنگەکان و کۆنترۆڵی خۆت بکە.

لە کۆتاییدا دەگەیت بەوەی کە دەتویست تەنها بەردەوامبە و سڵی لێ مەکەوە چونکە بەردەوامی ڕێگای گەیشتنە بەو ئامانجەی کە هەتە.

## میهرەبانی و مرۆڤایەتی ببەخشەوە!

مرۆڤ زۆرە وەلێ هەستی مرۆڤایەتی کەم! لە زۆر شوێنی سەر ئەم زەوییە مرۆڤ دەبیندرێ و مرۆڤایەتی لە بەشێکیان دەبینی, مرۆڤایەتی بەمانا قوڵەکەی هەست کردنە بەبەرپرسیاریەتی ئەرك و هەماهەنگی, مرۆڤایەتی هەستێکە لە ناوەوەی مرۆڤە, لەو کاتەی کە ویژدان و میهرەبانی و بەرپرسیارییەتی لەهەر کەسێکدا هەبوو مرۆڤایەتیش هەیە, مرۆڤایەتی ئەوەیە کە (مۆنتیسکیۆ)ی بیرمەندی فەڕەنسی دەڵێت: (گەر شتێك بدۆزمەوە وڵاتەکەم (فەڕەنسا) سوودی لێ وەرگرێت بەڵام زیان لە جیهان بدات، ئەو شتە دەشارمەوە, ئاخر چونکە من بە ڕێکەوت فەڕەنسیم بەڵام وەکو پێویستی مرۆڤم).



ئەو قسەیەی (مۆنتیسکیۆ) پێمان دەڵێت کە مرۆڤایەتی چییە و لە چی هەڵوێستێکدا بۆمان بەدەردەکەوێت, مرۆڤایەتی بۆ ساتێك نییە هەمیشەییە هەستێکە تا ئەو کاتەی ڕوح بە گیانتەوە مابێ

پێسویستت پێی دەبێت, کاتێك دەوڵەمەندبوونی کەسانێك لەشساغی و پێگە و دڵخۆشـــی و زەنگینی و بەهای تایبەت بەخۆیان بونیاد ناوە ناکرێت پێی غەمباربیت و لەدژی بوەستیتەوە و پلانیان لە دژ دابڕێژی, مرۆڤایەتی وەك ئەوەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فێری کردوین و فەرموویەتی: (ئیمانی هیچ یەکێک لە ئێوە تەواو نابێت تاوەکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆشبێ) - (رواه البخاری).

مەرج نییە هەمووکات مرۆڤایەتی لە نێوان مرۆڤەکان ئاڵوگۆڕی پێ بکرێت تەنانەت ئەوکاتەی ئاژەڵێکیش پێویســـتی بە یارمەتی تۆیە دەکرێت خۆتی لێ نەدزیتەوە و یارمەتی بدەیت مرۆڤایەتی ئەوەمان فێردەکات لانیکەم ئازاری ئاژەڵان نەدەین ئەوکاتەی بۆ دڵخۆشـــی خۆمان بەدوای پشـــیلەی کۆلانەکە دەکەوین و لێیان دەدەین مرۆڤ بونمـان دەکـەوێتـە ژێر پرســـیـارەوە, بێویژدانی گەیشـــتۆتە ئاســـتێك کلکیان دەبڕڕێت و ئازاریان دەدرێت و دەسوتێندرێن ئەو سەگ و ئاژەڵە کێویانەی تر کە زۆر بێتاوانن و بێ ئەوەی ئازاری کەس بدەن ئازاریان دەدرێت پرسیار دروست دەکەن لەســـەر مرۆڤایەتی, خودای گەورە لە پیاوێك خۆشـــبوو لەبەر ئەوەی ســـەگێکی لە تینویەتی ڕزگارکرد و ئاوی پێدا تۆش سۆز و بەزەیی ببەخشـەوە تا خودای گەورەش بەسۆز و بەزەیی بێت بەرامبەرت.

جیاوازی لەنێوان ناوەندی شـــارە گەورە و بازرگانی و جەنجاڵە کان چییە لەگەڵ دارســـتان ئەوکاتەی بەهێزەکان زاڵببن بەســـەر لاوازەکان ئاژەڵێك کە هیچی لەدەست نایێت جگە لەوەی لەدەستت ڕابکات لە ترسی ئەوەی نەیکوژیت چ سودێك دەبینی لەو کارەت جگە لەوەی خۆت دەیســـەلمێنی کە تکەیەك لە ویژدان و هەســـتی مرۆڤایەتی بوونی نییە لەتۆدا, میهرەبانبە و نموونەیەکی جوانی مرۆڤایەتی ببەخشەوە لەهەر شوێنێك بویت ڕەنگە کەسانێك هەبن چاو لەتۆ بکەن.

## هەموو پشوودرێژییەك بەهێزی نییە!

ئەگەر بە ڕەهایی بڵێین" هیچ شـــتێك مەحاڵ نییە "ئەوە زیادە ڕەوییەکی تێدایە و دەبێت دڵنیا ببینەوە لەوەی مەرج نییە ئەوەی لەمێشکی خۆماندا هـــیـــوای بـــۆ دەخوازین هـەروا بـە ئـاســـانی پێی بگەین و تەنانەت ڕەنـگـە پـێشـــی نەگەین, بۆ نموونە پشودرێژی لەسەر کـــارکـــردن لای خاوەنکارێکی (بێ ڕێز) جگە لە بێبە هـاکردنی خۆمـان هیچی تر وەدەست نـاخـەین چی لـەو کـارە بکـەم کـە بـە شـــێوازێکی کۆیلە ئاســـا فێری بوبم, زانســتێکم بۆ چییە کە بە شکاندنەوە و لێدان و سـوکایەتی



پێکردن پێم بەخشرابێ, چۆن ئەو نانە دەرخواردی خۆم بدەم کە بە منەتەوە پێم دەبەخشـــرێ, خودایەك کە بەو هەموو گەورەییە و خاوەن دەســـەڵاتە بێهاوتایەی ڕێزی منێکی بەندەی بێ دەســـەڵات بگرێ و ئایەتێك دابەزێنێ لەسەر ئەو باسە دیارە باسێکی گرینگە و لە ســـوڕەتی (الاســـراء) دەفەرمویێت: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ

وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا) (٧٠) واتا سوێند بەخوا بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت وە لە وشکانی و لە دەریادا هەڵمان گرتن ( بەسواری و گەڕانمانن) و ڕۆزی پاك و خاوێنمان پێداون وە فەزڵمان داون بەسەر زۆرێك لەو شتانەی کە دروستمان کردوون بەفەزڵێکی گەورە, پێش ئەوەی دیاری بکرێت ڕێزی تۆ لە کوێیە لەهەر شوێنێکی بۆخۆت ڕێزی خۆت دیاری بکە و وابکە بەردەوام سنورێك هەبێ لەنێوان خۆت و کەسی بەرامبەر ئەگەر ئەوە نەکەی هیچ پەرژینێك نامێنێتەوە پارێزگاری لە کەسایەتی تۆ بکات.

کەسایەتی هەریەکەمان زۆر لەوە گەورەترە بخرێتە دوا شوێن بۆ بیرکردنەوە لێی و گرینگی نەدان پێی ئەگەر هەروا بە ساویلکەیی بەدوای ژیان ڕابکەین پەشیمانییەکی قوڵ بەرۆکمان دەگرێت لە کاتێك کە سوودێکی نابێت بۆمان, گرینگی بەوە بدە چۆن مامەڵە دەکەی و چۆن مامەڵەت لەگەڵ دەکرێت پشوو درێژی تا سنورێك باشە و کە ئەو سنورە نەما دەبێت بە (گەمژەیی) بۆیە کە بڕیاری ئەوە دەدەیت کە بەردەوامبی لەسەر پشودرێژیت ئەوە بزانە هۆکار چییە و لەبەر چی و لەپێناو چی دواجار چیت دەستدە کەوێت لە پشوودرێژیەکەت وە ئایا هیچ شتێك لەدەست دەدەیت یاخود نا وە ئەگەر لەدەستی بدەیت بۆ نموونە چییە ئەو شتە؟ کە هەموو ئەوانەت دیاری کرد و ڕوون بویەوە لات تێدەگەی لەوەی باشترە خاڵی کۆتایی ڕستە دابنێی و کۆتایی بەو پشودرێژییە بێنی یانیش باشترە بەردەوامبی و چاوەڕێی قەدەر بکەی بتگەیەنێت بە کەنارێك.

هەندێ کات پشوو درێژی نیشانەیەکە بۆ عاقڵی و هەندێك ساتیش نیشانەی (گەمژەییە ) بۆ نموونە پشوو درێژیت لەسەر خوێندنی (١٤-١٦) ساڵ و تەنانەت بەرەو زیاتری قۆناغەکانی خوێندن بە ئامانجی ئەوەی بگەی بە پسپۆڕییەك نیشانەی پێگەیشتوویی تۆیە لە خاڵێکدا و لەخۆت دەپرسی بەدیل و جێگرەوەی خوێندن چییە

ئەگەر خوێندن فێری زانســـتێکت بکات نەخوێندن فێری چیت دە کات لەکاتێکدا لە سەردەمی تەکنەلۆژیا و فیکر و دونیای زانست و زانیاریدا ژیان دەگوزەرێنین و ئەوە بۆ زۆر باسی تر هەمان شتە. بەڵام لەهەندێك کاتدا ئەوە (گەمژەییەك)ی یەکلاکەرەوە دەگەیەنێ بۆت بۆ وێنە مرۆڤێکی لاوازی بێدەســـەڵات لـەپای چی خۆمی بخـەمـە ژێردەســـتـە و وەك کۆیلـەیـەکی کڕراوە مـامـەڵـە بکـات بەرامبەرم لەکاتێکدا خودای گەورە ئەوەی بۆمان ڕوونکردبێتەوە و یەکلا بووبێتەوە کە ڕۆزیمان یەکلا بۆتەوە و بەدەســـت هیچ کە سـێك نییە جگە لە خودای تاك و تەنیا و بەخشـندەی میهرەبان, وە دڵنیامان دەکاتەوە و لە ســوڕەتی (الذاريات) موژدەمان پێ دەدات و دەفەرموێت: (وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ) (٢٢) واتا ڕزق و ڕۆزی ئێوە و ئەو بەڵێنانەی پێتان دەدرێت لە ئاســـمانە, لەپای چیدا خۆم بخەمە نەگبەتیێك کە ڕووم نەبێت ســەر هەڵبڕم و باســی هێز و دەســـتکـەوتـەکـانم بکـەم, ئـەوە بـەهێزی تۆ نـاگـەیـەنێ کـە ئارامگربی لەهەمبەر نادادپەروەرییەك کە بەرامبەرت دەکرێت بەڵکو دەبیت بەبەشێك لە پڕۆژەی نادادپەروەری بەرامبەر خودی خۆت پێش هەموو شـــتێك ئەوە ناتکات بەخۆت دوورت دەخاتەوە لە گەیشـتن بە بەهای کەســایەتی خۆت بۆیە پشــوودرێژبە لەپێناو بونیادنانی خۆت بەسەربەرزی نەوەك هەیکەلێکی ڕووت, (میشێل فۆکۆ) فەیلەسوف و مێژووزان و تیۆرزانی کۆمەڵایەتی وڵاتی فە ڕەنسـا دەڵێت: (بێ دەنگی هەمووکات نیشـانەی ڕازی بوون نییە, زۆرجار ئەوپەڕی نائومێدییە لەئاســـت شـــعوری کەســـانی بەرامبەردا) پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت: (جام کە پڕبوو لێی دەڕژێت) ئەوەش هەمان شێوە پێویستە ئەو جامە ببینی کە ماوەیە کـە لێی دەڕژێـت و بێخـەبـەر لێی ســـەیری دەکـەیـت ئـەگـەر بەرامبەری هەر شـــت و کەس و بارودۆخێکی و هەســـت بە نـائـارامی دەکـەیـت و پشـــوودرێژی و لـەنـاخـەوە بێ ئۆقرەیی دایگرتویت پێویســـت بەوە ناکات چیتر ئەو پەنگاوەی ناوەوەی خۆت بەردەوامی پێ بدەیت و ئەو هەستە دەرببڕە و ژیانت بگۆڕە

و لەو چەقبەســـتوییە وەرە دەرەوە, چونکە جگە لە کارەکتەرێکی خراپ کە ڕۆڵێکی خراپ دەگێڕیت هیچیتر نیت و بەوەش ویژدان و دڵت ئارام بکەرەوە چونکە ئەوە باشترە لەهەر شتێك کە خەریکی بۆی ئەو ڕۆڵە خراپە دەگێڕی و نایەڵێت ببیت بەو کەســـەی کە خۆت دەتەوێت.

**گشتاندن بۆ حاڵی خۆت مەکە لە دوو کاتدا!**

بەدرێژایی وێســـتگەی ژیانی مرۆڤایەتی بە چەندین بارودۆخ و کات و ســاتی جیاوازدا تێپەڕیون لەهەندێك کات ســەقامگیری و ئاسایش باڵی کێشاوە بەسەر دونیادا لەبەرامبەردا هەندێك سەردەم شـەڕ و ئاشوبە مرۆڤایەتی خستۆتە مەترسییەوە, لە ئێستاشدا هە ندێك ناوچەی جیهان خۆشبەختی و ئارامی بەسەریدا بڵاو بۆتەوە




و ژیانێکی شـــایســـتە بەســـەر دەبەن و هەندێك ناوچەش هەیە بە تەواوی لەژێر شەڕ و خراپەکاری و برسییەتیدان ئەوە سروشتی مرۆڤایەتییە و بارودۆخەکان سەقامگیر نابن بەگشتی و بەردەوامی

بۆیە ناکرێت هیچ کات گشـتاندن بکرێت بەوەی ئەو حاڵەی ئێسـتا تێیدایت بە تەواوی سـەقامگیردەبێت و ناگۆڕێت هەمیشـە لە ئامادەباشـیدابە بۆ هەر گۆڕانێك کە لەوانەیە ببێت لە هەر کات و ساتێکدا.
ئەو دوو کاتەی زۆر ترسـناکە گشـتاندنی بۆ بکەیت یەکەمیان ئە وکاتەیە کە زۆر دڵخۆشـی وادەزانی هەموو دونیا هی خۆتە, ئەوە بێهۆشـکەرێکە بێ ئەوەی هەسـتی پێ بکەیت وادەکات بەتەواوی واز لە هەموو ئەو ئەگەرانە بێنیت کە ڕوودەدەن ئەوکات ناتوانیت ئامادەگیت تێدابێت بۆ ئەو حاڵەی کە تێیکەوتویت, خەڵکانێکی زۆر هەبوون بەو دەسـەڵاتە دەنازین کە هەیانە بەو شـێوەیە گشـتاندنیان دەکرد کە تاوەکو لەژیاندا مابن خاوەنی ئەو پێگە و دەسـەڵاتە دەبن ئـەوە وای دەکرد لـەخۆیـان دەربچن و خۆیـان توشـی چـەنـدین مەترسی دەکردەوە لەبەر ئەوەی پشت قایمیان تەنها ئەو ساتە بوو کە خاوەن پێگە و دەسەڵاتن بەڵام کاتێك سنورەکانیان دەبەزاند, ئە وکـاتـانـەی لـەخۆیـان دەردەچوون و لافی پێگـە و دەسـەڵات و موڵکداری و خاوەندارێتی بەهانایانەوە نایێت ئەوکات تێدەگەن لە وەی هەڵەیەکی کوشـندەیان کردووە و باجەکەشـی بە دڵنیایی هـەرخۆیـان دەیـدەن, ڕاگـەیـانـدنکـاری دیـاری لوبنـانی (جۆرج قەرداحی) دەڵێت: (دوو شت دیاری دەکەن کە تۆ کێی, ئارامگریت کاتێك هیچت نییە, ڕەوشـتت کاتێك خاوەنی هەموو شـتێکیت) هەریەك لە ئێمەش ئەو سـاتانەی بە تەواوی دڵخۆش و کامەرانین و لەهیچ شـتێکمان کەم نییە ئەوە مانای ئەوە ناگەیەنێ خاوەنی هەموو شتێکین و هەرچیمان بوێت دەیکەین بێ ئەوەی حیساب بۆ هیچ یاسـایەکی دونیا بکەین, وردتر بیڵێین ئەوکاتانەی هەسـت دە کـەیت متمـانـەی خـەڵکیت بـەدەسـت هێنـاوە یـان موڵکدار و سـەرمایەداریت ئەو سـاتانەی دەگەیت بە پێگەیەك دەبێت ئەوەش بزانیت تاسـەرنییە و ڕۆژێك دێت کەسێکی تر جێگات دەگرێتەوە بۆیە سـنورەکان بزانە و تەنها بیرت لای خۆت و سـەرمایەکەت

نەبێت خۆپەرستییەکەت باجی قورس بەدوای خۆیدا دێنێت وریابە وە لێی.
دووەمیان ئەوکاتەی بە سەختی و نارەحەتیدا تێپەڕ دەبیت, ژیری نییە لەو حاڵەتانە گشتاندن بۆخۆمان بکەین و گلەیی و ڕەشبینی بە سەر خۆماندا ببارێنین بڵێین هەرگیز ناتوانین گۆڕانکاری لەژیانی خۆمان بکەین ئێمە قەت ناتوانین بەرەو پێشەوە بچین, تا ئەوە ئێمەین دەست بە گۆڕانکاری دەکەین ئەوە مرۆڤایەتییە زەوی لە تەختێك وشکایی و سەوزاییەوە کردۆتە ملیۆنان باڵەخانەو شاری گەورە و بازرگانی خودای گەورە توانای ئەوەی بە مرۆڤ دابێت نەوت لەنێو قوڵایی زەوی و کانی نەوتی نێو دەریا گەورەکان وەدەربێنێ و بیکات بە سەرمایە و هەزاران داهێنانی گەورە کە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدایە, تۆش مرۆڤی نە کەس لەتۆ زیاترە نە کەسیش لەتۆ کەمترە خودا چۆن توانای ئەوە بەتۆ نادات گۆڕانکاری لەخۆتدا بکەیت ئەوە ڕەشبینییەکی بەد و خراپە گشتاندن بکەیت ئەگەر لە بارودۆخێکی سەخت و دژواردایت, واز لە هەموو ئەو ڕەشبینیانە بێنە تۆ باش دەبیت کەسایەتییەکی بەهێز بۆخۆت دروست دەکەیت هەموو ئەو خراپییانەی کە دێنەڕێت وانە بەتۆ دەدەن پێت دەڵێن بەهێزی و هێزی خۆتت پیشان دەدەن, تۆ هیچت لەکەس کەمتر نییە تەنها ئەوەی پێویستە لەسەرت دە ستپێکردنە خاڵی دەستپێك نهێنی سەرکەوتنە بۆیە دەست بەوە بکە کە دەتەوێ ئەنجامی بدەیت هەوڵی بۆ بدە ئەگەر هەوڵیش دەدەیت و سەرکەوتوو نابیت وەك زانای بەناوبانگی ئەڵمانی لە بواری فیزیا و بوارەکانی تری زانست (ئەلبێرت ئەنیشتاین) دەڵێت ( :گەمژەییە ئەگەر بەبەردەوامی هەمان شت دووبارە بکەیتەوە و چاوەڕێی ئەنجامێکی جیاوازبکەیت) ئەو وتەیە پێمان دەڵێت ئەو ڕێگایەی کە پێیدا دەڕۆی هەڵەیە ڕێگایەکی تر بگرەبەر, شێوازە کەت بگۆڕە چونکە هیچ کات کۆتا وێستگە نییە بۆتۆ تەنها ئە وکاتە نەبێت کە دەستبەرداری حەز و ویست و خولیایەکانت دەبیت و ناتوانیت جێگایان پڕ بکەیتەوە بە حەز و ویست و

خولیایەکی تر هەمیشە لەو کاتانەی کە پێویستن بڕوای گۆڕانکاری لەخۆتدا دروست بکە و نوێی بکەوە لەخۆتدا متمانەت بەخۆت هەبێت سەرکەوتوو دەبیت پێچەوانەکەشی ڕاستە.

.

## شەرم لەو شتانە مەکە کە تۆ لێیان بەرپرسیارنیت!

شتگەلێکی زۆر هەن کە وادەکەن ئادەمیزاد هەست بە کەموکوڕی بکات لێیان و وا تێڕادەمێنێ لەخۆی کە ئیتر ئەوە شـــەرمێکی نە بڕاوەیە پێیەوە لکاوە بۆ هەمیشە ئیتر دەبێ سەری خۆی لە ئاستی کزبکات, هەڵەبینینێکی ناهۆشـــیارانەیە بەرامبەر بەخۆت و بە هە ست و دڵی خۆت, بێ ئاگایی لەو هەڵەبینییە بەپێی کات کاریگەری خراپ بەجێ دەهێڵێ لەسـەر ناخ و دەروونی کەسـەکان, بەندەیەك



ئەندامێکی جەسـتەی بەشـێوەیەك نەخشـێنرابێ لەلایەن پەروەرێنە وە, مەگەر ناتوانرێ ئەو بکرێت بە جوانترینی سەرزەمین لەلایەن خودای گەورەوە!؟ زولەیخای خێزانی فیرعەونی بە موعجیزەیە ك هێنایەوە تەمەنی گەنجی ســـەرباری ئەو هەموو خراپییەی

بەرامبەر نێردراوی خودای گەورە و پێغەمبەر (یوسف) (علیه سلام)ی کردبوو!
نا... ئارامگری فێری هەریەکەمان دەکات پاداشتێکی نەبڕاوەت بۆ ئامادە کراوە لەپای ئەو ئارامگری و شوکرانە بژێرییە, لە سورەتی پیرۆزی (ال عمران) خودای گەورە بەبەندەکانی دە فەرموێت: ( وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِين)) ١٤٦) واتا خودای گەورە ئارامگرانی خۆش دەوێت, دەبێت چی موژدەیەك لەو موژدەیە خۆشتربێت کە خۆشەویستی خودای گەورەبیت لەپای سوپاسگوزاری و ئارامگری بەرامبەر ویستی خودای جیهانیان, خودای گەورە زانایە بەهەموو ئەوانەی شوکرانە بژێرن بۆیە نا ئومێد مەبە (أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ) (٥٣) (الانعام).
ئەگەر کەموکورییەك لەخۆتدا دەبینیت و هەست بەوە دەکەیت کە بێبەشی لە دیارییەك کە خودای بەدیهێنەر بەخشیویەتی بەهەرکەسێك ئەوا تۆش دیارییەکی گەورەت پێ بەخشراوە کە کەسانی تر ڕەنگە بێبەشبن لێی بۆیە بەدوای ئەو دیاری و بەخشیش و بەهرەیەی خۆتدا بگەڕێ ئەو هێزە بدۆزەرەوە و چیتر کات بەفیڕۆ مەدە, تۆ دەتەوێ هەمووان بیرکردنەوەیەکی تەندروستیان هەبێت کە ئەستەمە بەڵام ئەو کاتانەی هانی کەسانێکیش دەدەیت بۆ ئەوە پێویستە خۆت تاقیت کردبێتەوە لانی کەم باشترین ئەو ئامۆژگاری و هاندانانە ئەوانەن کە پێش ئەوەی ببەخشرێن بە کەسانی تر خۆت سوودت لێیان وەرگرتبێت بە پێچەوانەوە بەهایەکی نابێت هەر لەبەر ئەوەیە لەخۆتەوە دەست پێبکە بۆ هەر شتێك, خۆت بگۆڕە پێش ئەوەی داوا لە خەڵکی بکەیت خۆیان بگۆڕن و واز لە خوێکی بەد بێنن, چونکە ئەوە شتێکە خۆت لێی بەرپرسیت و جێگای شەرمیشە, وەك ئەوەی نوسەری ناوداری ڕوسی (لیۆ تۆڵستۆی) دەڵێت: (هەموو کەسێك بیر لەوە دەکاتەوە دونیا بگۆڕێت, بەڵام کەس بیر لەوە ناکاتەوە خۆی بگۆڕێت).

## چاکسازی خەوشییەکانت بکە!



خـەوشـــييـەكـانـت بزانـە!
هـەموو مرۆڤێك قـابيلى ئـە
وەيـە لـەژيـانى چـەندين هـە
ڵـەى گـەورە و بچوك بكـات
و تـەنانـەت هـەنديكيان باجى
گـەورەى پىَ بـدەن, چونكـە
مرۆڤ بە لاوازى لە ئاستى
هەنديك شتدا دروست كراوە
و دەسـەلاتى هەموو شـتێكى
نييـە و نـاتوانێـت پـەى
بەهەموو شــتێك ببات و بير
لەوە بكاتەوە داهاتوو ببينێت
بۆ ئـەوەى بڕيـار لـەســـەر
كارى ئـەمڕۆى بدات و بەر
لەوە پەرچەكردارەكەشـــى
بـزانـێـت, هـەر ئـەوە نـا
زۆربەى هەڵەكان ئەو هە
ڵانەن كە خۆمان دركى پىَ دەكەين و دەزانين هەڵەيە بەڵام هەر دەيكەين و دەشـــزانين ڕۆژێك لە ڕۆژان لێى پەشــيمان دەبينەوە, پێغەمبەرى خودا (ﷺ) دەفەرموێت: (كل بني آدم خطاء, وخير الخطّائين التوابون) واتا هەموو بەنى ئادەم هەڵە دەكات, باشــترين هەڵەكاران تۆبەكارانن, بۆيە لەهەر هەڵەيەك دايت مەگەڕێرەوە ســـەرى و تۆبەيەكى يەكجارەكى لىَ بكە پێش ئەوەى بەخەڵكى ناحاڵى لە ژيان و پێكەوەژيان بگات و بكەويتە بەر هێرشـــى بىَ بەزەييانەيان و بيكەن بە بنێشتە خۆشەى سەرزاريان, لەوە دڵنيابە كە بێباكن لە ئاسـت هەسـتى تۆ لەو كاتەيا و بگرە وەك گورگێكى برســى بەدواى خاڵە لاوازەكانت دەگەڕێن لەپێناوى ئەوەى ســوودێك بەخۆيان بگەيەنن ئەگەر ســوودێكيش نەبينن لەوە بەلاى

ئەوانەوە ئەوە بەسە کە زیان بەتۆ بگەیەنن! ئەوە بووەتە خووێکی بەد وەك نەخۆشـــییەکی گواســـتراوە بەنێو زۆرێك لە خەڵکی دەروون نەخۆشدا بڵاو بووەتەوە.
بەر لەوەی هەڵەکانت دیاری بکەن باشترین کار کە بیکەیت ئەوەیە خۆت پەنجە لەســەر ئەو برینە دابنێییت و کاری لەســەر بکەیت بۆ ئەوەی نەبیتە نێچیرێکی حەپەســـاو و بێ ئۆقرە کە هەمیشـــە لە ڕاکردن دابیت لەترســـی ڕاوچییەکان, وە دڵنیابە لەوەی ئەوەی کە لە ناخەوە لەخۆتدا دەیگۆڕیت هەر ئەوەیە کە لە دونیای دەرەوەشــتدا دەگۆڕێت چونکە هەتاوەکوو لە ناخی خۆتدا ئەوە نەکەیت ناتوانیت زاڵبیت بەسەر ئەو بەربەستەی کە لەپێشتە و گۆڕانکاری تێدا بکەیت, ئەوە لەخۆتدا بەرجەســـتە بکە بە زوویی دەرئەنجامە کەی دەبینیت.

**چاوەڕوانی هەموو شتێك لەکەس مەکە!**

هیچ کەسێك وەك ئەو کەسەی کە پشت نابەستێت بەهیچ کەسێك بە دژواری و قوڕســـی کارەکانی ئەنجام نادات و هەرچەند کارێکی بە تەواوی ڕاســـت نەبێت بەڵام لەزۆربەی کاتەکان باشـــترینە و لەزۆر کاتیش بە پێچەوانەوە کە ڕاوێژ و تێگەیشـــتن لە شـــتەکان ئەنجام دەدەیت دەکرێت ئاسانتر کارەکانمان تێبپەڕێنین.
خۆت دڵســـۆزترین کەســـی خۆتی! بۆ نموونە بەشـــێك لەوانەی پەنایان بۆ دەبەین لەوانەیە کەمێك غەمبار ببن بەڵام هیچیان پێ ناکرێت, هەندێکیشـــیان کەمێك کاریگەر دەبن و دواتر لەبیری دە کەن, ئەوەش ئەگەر زیانی نەبێت ســـوودێکیشـــمان پێ ناگەیەنێ, مرۆڤەکانی ئەم ســـەردەمە زۆربەیان بەدوای بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە وێڵن نە دەیانەوێ تۆ ببیت بەخۆت نەخۆشـــیان خۆیانن, چاوەڕوانی هیچ کەس مەبە تۆ بکات بەو کەسەی کە دەتەوێ ئەوە خۆتی ئەوە دەکەیت باشتر بیڵێم ئەوەی کە خۆت هەوڵی بۆ دەدەیت و دەبیت پێی زۆر باشـــترە لەوەی خەڵکی دەتکەن پێی, مەرج نییە هەموو دەســـت درێژکردنێك دەســـتی یارمەتی بێت, لەوانەیە بە



شێوەیەك دڵت بڕەنجێنن یان توشی دەردەسەرییەكت بكەن كەس حاڵی بە حاڵت نەخوازێ وەك ئەوەی (ویلیام شكسپیر) كە یەكێكە لە گەورە شاعیر و نوسەر و شانۆنووسی مێژووی مرۆڤایەتی و ئەدەبی جیهانی و بە (شاعیری نیشتیمانی ئینگلتەرا) ناسراوە دەڵێت: (چاوەڕوانییەكان ڕیشەی هەموو دڵ شكانەكانن).
گرینگی بە كات بدە كاتەكانت لەوە گرینگترە بەفیڕۆی بدەیت لە چاوەڕانیت بۆ كەسێك كە گرینگ نیت لای, گرینگترین شت لە وەی بیزانی ئەوەیە كە تۆ پێویستت زیاتر بەخۆتە لەوەی پێویستت بەكەسانی تربێت كەس ناتوانێت ڕاتبگرێت لە هەنگاوەكانت كاتێك پشتت بەخۆت بەستووە, بەهێزەوە دەوەستی لەبەردەم لەمپەرەكان و متمانەی زیاترت بەخۆت هەبێت باشترە لەوەی متمانەی خۆت لەدەست بدەیت و پشت بە كەسانی تر ببەستیت, لەبەر ئەوەی تاكە كەسێك كە بەدوایدا بگەڕێیت ئەو كەسە خۆتی لەناخی هەریەكەماندا ئەو هێزی پشت بەخۆ بەستن و متمانەیە بوونی هەیە ئەو هێزە بپارێزە گەوهەرێكی بەنرخە.
لەژیانی زۆربەماندا خەم و ناخۆشی بەشێكی داگیر كردووە بۆیە ئەوە بە مانای ئەوە نایەت كە وا بیربكەینەوە تەنها ئێمەین لەم گەردوونە خەم و ناخۆشی بەدواماندا دەگەڕێت نا بەڵكو هەموو كەسێك خەمێكی هەیە بەڵام بەهێزەكان ئەوانەن بەسەریاندا زاڵدەبن, كاتێك پەنا بۆ كەسێك دەبەین با لەوە دوودڵ نەبین كاتێك بە سینەیەكی فراوانەوە پێشوازیمان لێ ناكات لەوانەیە ئەویش خەمێكی هەبێت و نەتوانێت باسی بكات لەناخی خۆیدا پەنگی دابێتەوە وەك ئەوەی (عمر ال عوضە) نوسەری گەنجی عەرەب و وڵاتی سعودییە دەڵێت: (نەكەی پەنا ببەیتە بەركەس تا نهێنییەكانی خۆتی لا باسبكەیت, سینەی خەڵك بچوكترە لەوەی شوێنی كێشەی تۆی تێدا ببێتەوە, با خودا پەنای هەمیشەیی تۆبێت) زاتێك كە نە دەخەوێت و نە ماندوو دەبێت هەمووكات كاتی هەیە بۆت بۆ نەبێتە پەناگەی هەمیشەییت بۆ پەنای بۆ نەبەین لەكاتێكدا زاتی خۆی لە سورەتی (ال عمران) پێمان دە

فەرموێت:(وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّـــمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَــيْءٍ قَدِيرٌ) ( ١٨٩) واتا هەر بۆ خودایە پادشـایەتی و موڵكی ئاسـمانە كان و زەوی وە خودا بەســـەر هەموو شـــتێكدا زاڵە, پەناگە و ئارامگەی دڵەكانمان هەمیشەیی لای خودای میهرەبانە بۆیە داوای هەرچییەك بێت با لەو داوای بكەین, تەنیا لەخودا دەتوانین داوای هەموو شـــتێك بكەین هەرچییەك هەبێت لەتوانای ئەودایە نەوەك بەندەكانی, دڵنیابە لەوەی ئەگەر شتێك لەخودای گەورە داوا بكەیت زۆر زیاترت پێدەبەخشـــێت لەوەی لە كەســـێكی داوا بكەیت ســـەرەنجام لەوەیە كەســـێك بكات بە هۆكار تا وەڵامت بداتەوە فریادڕەسی ڕاستەقینە هەر خودای میهرەبانە نەوەك كەسێكی تر.
ئەو كاتەی دەكەوی هیچ كەس ئاوڕت لێ ناداتەوە و هەریەكەیان بە شـــێوازێك خۆیت لێ دەدزێتەوە لەترســـی ئەوەی بكەوی بە سەریانا بۆیە پشت بەستوو بەهیچ بەندەیەك مەبە بەڕێژەی سەدا سـەد لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر ئەو كەسـە پشـتت تێبكات, هەر لەبەر ئەوەش متمانە بەهیچ كەسێك مەكە بەو شێوەیەی پشتی پێ ببەستی و تەواوی ژیانی خۆت بە یارمەتییەكانی ئەو ببەستیتە وە, چونكە ئەوە لە دوو لایەنەوە خراپەی تێدایە لەلایەك دەبێت بەبارێكی قورس لەســـەر شـــانی ئەگەر ئەو كەســـە باوك یان بەخێوكاریشـت بێت, هەوڵی خۆت بدە بە ماندوو بوون و تەقەڵای خۆت بگەی بە كەنارێكی ئارام گرینگ نییە ئەو ڕێگایە چەندە قورســـە و ئاڵۆزی تێدایە گرینگ ئەوەیە ئەوە ڕێگا ڕاســـتەكەیە, لایەنی دووەمی ئەو ئاڕاسـتەیە ئەوەیە هیچ كەس تاســـەر بۆكەس نامێنێ و ڕەنگە بەهۆكارێك ئەوكەسـە بۆتۆ نەمێنێت و پێویستە لە ســـەرت خۆت ئیتر بەرپرســـیاریەتییەكان بگریتە ئەســـتۆ ئەگەر تەواوی ئەو ماوەی پێشتر پشت بەستوو بەخۆت نەبوو بیت ڕەنگە نەتوانیت بەرپرسیارییەتییەكی لەو شێوەیە بگریتە ئەستۆ و بگرە بە بارودۆخێكی سەختدا تێپەڕببیت, بۆیە پشت بە هێز و تواناكانت ببەسـتە ئەگەر كەمیش بن كاریان لەسـەر بكە دەتوانیت بەهێزیان بكەیت و كەســـایەتییەكی بەهێزی نێو كۆمەڵگات لێ دەربچێت

نهێنی هەموو ئەوانەش ئەوەیە کە لەناخەوە خۆت دەناسیت و درك بەوە دەکەیت کە ئیتر خۆتیت نەوەك هیچ کەسێکی تر.

ئەو شـتەی کە لای هەندێکمان نرخی نییە لای هەندێك کەس زۆر بـە بـەهـایـە, لـە زۆر مـاڵ و خـواردنگـە و بۆنـە و ئـاهـەنگـەکـان خواردنێکی زۆر ئامادە دەکرێت و دواتر فڕێدەدرێتە نێو سـەلەی زبڵەکان لە کاتێکدا زۆر وڵات هەیە کە خەڵکەکەی لەخوار هێڵی هەژاریەوە دەژین و بەحەسـرەتی ژەمێك نانەڕەقەن, ئەو پارچە شـوێنەوارانەی کە هەن لەوانەیە نرخیان نەزانن و بیشـیدۆزنەوە فڕێیان بدەن بەڵام ئەوە لای شـوێنەوارناسـێك نرخی خۆی هەیە, هەر شـتێك نرخی خۆی هەیە ڕەنگە لای تۆ گرینگ نەبێ چونکە نرخی نازانی بەڵام مانای ئەوە نییە بۆکەس گرینگ نییە, بۆیە ئەو شـتانەی کە ئێسـتا هەتن شـتی بچوك نین تەنها تۆ بە بچوك دەیان بینیت.

دڵخۆشـی هونەرێکە هەمووکەس ئاشـنای نییە لەبەر ئەوەی زۆربەمان جڵەوی هەسـتەکانمان خۆمان مامەڵەیان لەگەڵ ناکەین بەڵکو داومانەتە دەسـت کەسـانێك زۆر بە ئاسـانی بە ئارەزوی خۆیـان یـاری پێ دەکـەن دڵتـەنگمـان دەکـەن وەك ئـەوەی هـەموو خۆشـی دونیا بچوککرابێتەوە لە مامەڵەی ئەو کەسـە لەگەڵمان هە ڵەیەکی کوشـندەیە, لەبەر ئەوەی مەرج نییە هەمووکات ئەوەی



ئێمە لەومان دەوێ بەو شـــێوەیەبێ زۆر لە خەڵکی بەدیار ئەو کە سانەوە تەمەنێك بەبا دەدەن کەسێك کە هەوڵی چاکەو دڵ خۆشیت نادات تۆش مافی ئەوە بەخۆت مەدە بەدیاریەوە خەم بخۆیت و تەمەنێك لەو نارەحەتییە بەڕێ بکەیت, ئەگەر لاتبێت ئەوە قابیلی ئەوەیە هاوبەشـــی لەگەڵ بکەیت ئەوکاتەی کە بەجێی هێشـــتی ڕابردوو و یادگاریەکانیشی بەدوای خۆیدا بنێرەوە.

ئەوەی ئێسـتا خاوەنی ئەوە هەموو شـتێکی تۆیە شـتێك کە هیتۆ نە ماوە خراپە لەگەڵ خۆتدا دەکەیت دابنیشـــی بەدیاریەوە داهاتووی بۆ بڕوخێنی, قەدری ئەو شـــتانە بگرە کە خاوەنیانی بەوە ڕازییە کە ئێستا هەتە, ئەوەیە هونەری دڵخۆشـی نەوەك ئەوەی لەدەستت داوە و ئـەوەی خـەڵکی هـەیـانـە, دڵخۆشـــبـە بـەوەی ئێسـتـات و بەردەوامبە لەوەی هەوڵی زیاتر بدەیت بە ماندووبوونی خۆت نە وەك ئیرەیی کوێرت کات بە موڵکی کەســـانی تر, بەدوای ئەو شـــتانەدا مەبە کە هیتۆ نین ئەوە خۆفریودانە هاوڕێ, لەواقیعدا بژی و چێژ و خۆشی لەو شتانە ببینە کە هیخۆتن.

## چێژ ببینە لەهەر شتێك!

دونیا دەرفەتێکە و ماوەکەی کورتە بۆیە پێوەری قورس لەسەر خۆشییەکان دامەنێ و مەیانکە بە شتێکی دەگمەن, خۆشییەکان دەگمەن نین تەنها هەستیان پێ ناکەین و هێندە قوڵ بوینەتەوە نێو دونیای خەم و پەژارە و نارەحەتییەکانمان بەجۆرێك پەلکێشی نێو ژیانمان کردووە کردوومانەتە بەربەستێك لەپێش هەستە تایبەت و نایاب و خۆشەکان, وازبێنە لەو خووە و بیکە بە دەستپێکێکی نوێ لەپێناوی هەستکردنت بە خۆشییەکان لەپێناوی چێژبینین لەهەر بەرەو پێش چوونێك لەهەر وەرچەرخانێکی نوێ و تازەدا لەهەر هەواڵ و بابەتێك دڵخۆشبە بەو مانایەی بیر لە خراپییەکان مەکەوە



ئەگەر خراپی نابینیت بۆی زیاد مەکە.
چێژ بینین و خۆشی دەربڕین و دڵخۆشی بە وێنەی ئەوەی ڕەنگدانەوەی بابەتەکانبیت لەکاتی خۆشی خۆشییەکانت دەربڕە لەکاتی هاتنەگۆڕێی هەر باسێکدا و پرس و بابەتەکان وەك خۆیان ببینە و بەهەموو شتێك دڵتەنگ مەبە, ببە بەخۆت پێتی دەڵێت کە تەلبەندی خۆشییەکانت نەکەیت تەلبەندی چێژ و هەست کردن بە

ســـاتە نایابەکان نەکەیت ڕەنگە ئەوە دەرفەتێك بێت و دووبارە نە بێتەوە.
وێڕای هەموو ناخۆشـــی و ســـاتە قوڕس و خەمناکەکان دەتوانیت دوونیابینی خۆت لێیان کورت نەکەیتەوە ئەوە گشـــتاندنێکی خراپە بۆخۆتی دەکەیت, ئاگاداربە لەوەی زیان لەخۆت و هەســـتەکانت دەدەیت زۆر پرسـی نویَ و باش هەن دەتوانیت هەستیان پێبکەیت خراپە لەگەڵ خۆتدا مەکە بەوەی بەهای خۆشـــییەکان لەدەســـت بدەیت چونکە ئەوە خۆتی دەتوانیی بەها بدەیت بە خۆشـــییەکانی ژیانت دەتوانیت بەهایان بەرز بکەیتەوە و باشتر لەگەڵیاندا مامەڵە بکەیت و لەهەمان کاتیشـــدا بێبەهایان بکەیت کە دووربیت لە هە ست کردنت بە هەموو خۆشـــی و ســـاتە چێژ بەخشـــەکان, لە بێبە هاکردنی ســـاتە خۆشـــەکاندا تەنها لەکیس چوونی ئەو ســـاتەت بۆ نامێنێتەوە بەڵکو پەرە بە خوویەك دەدەیت لەخۆتدا کە دەکرێت سەرەتای ڕەشبینییەکی توندبێت بەرامبەر بە ژیان ئەگەر لەسەری بەردەوامبیت خراپی زۆرت دێننە سەرڕیَ تەنانەت خۆشییەکانیش بە ناخۆشی لێك دەدەیتەوە و هەموو باشییەکان بە دیوە خراپەکەیە وە دەبینیت, هەر لەبەر ئەوەشە بژاردەی هەست کردن بە خۆشی و چێژبینین لە ساتە خۆشەکان بژاردەی یەکەم و بژاردە دروستە کەیە.
چێژ لەو ڕێگایە ببینە کە پێیدا تێپەڕ دەبیت ئەگەر بەبێ چێژ لیَ بینین و خۆشـــی وەرگرتن ویســـتت هەر کارێك بکەیت یان بەرەو ڕێگایەك بڕۆیت یان هەر بابەتێکی تر دوو هەڵبژاردە دێنە پێشـــت یان ئەوەتا بەدرێژایی ماوەکە توشـــی خودئەشـکەنجەیی دەبیت یان ئەوەتا ناتوانیت بەردەوامبیت و زوو چۆك دادەدەیت, بۆیە پێویستە تەنانەت سـەختیەکانیش بە چێژ لیَ ببینن و بە هۆکاری فێربوون و وانە و ئەزموون بیبینەوە قبوڵ بکەیت و مەیانکە مایەی شـــکان و ناڕەحەت مەبە پێیان ڕەنگە ئەوە هۆکارێك بێت بۆ ئەوەی باشـــتر خۆت ئامادە بکەیت بۆ هەنگاوەکانی داهاتووت بۆیە هەموو پرسە لاوەکی و قسە لابەلاکان بەلاوەبنیَ و خۆت و ئامانجەکەت بەیەکە

وه خودناوەندییەك دروست بکەن کە هیچ کەس و شتێك نەتوانێت زاڵ بێت بەسەر ئەو هێز ورەیەی تۆوە, ئەگەر تا ئێستا دڵنیا نیت لەوەی ئەو هێزە لە بوونی تۆدا ئامادەگی هەیە یاخود نا لەم دێڕە وە دڵنیا ببەوە لەوەی ماتەوزەیەکی زۆر بەهێز لە بوونتدا هەیە تەنها پێویستی بەوە هەیە کە تۆ بیدرکێنی و هیچی تر, بۆیە با چیتر قەتیس نەبنەوە لەنێو تۆدا هێزی خۆت پیشـــان بدە لە ڕێگای ئەو ماتەوزەیەی ناوەوەی خۆتەوە و دواجار چێژ لە بوونی خۆت و ساتە بەنرخەکانت ببینە.

## گاڵتە بەهەموو شتێك مەکە!

ئاگاداربە شـــتانێك هەن مایەی گاڵتەپێکردن نین هێڵی ســـورن ئاگاداریانبە !بیر و باوەڕی کەســـەکان, خەون و ئامانجیان, ڕوخسار و شێوەی جەستەیان, دەنگ و شێوازی دەربڕین, حەز و ویســـت و ئارەزووەکان, بارودۆخی ماددی و نەخوێندەواری و جۆری بڕوانامە هیچ یەك لەوانە شـــایەنی پێکەنین نین کاتێك کە سێك لە پاسدا یان لە شوێنێکی گشتی یان هەر شوێنێك دەکەوێت لەبری ئەوەی پێی پێبکەنیت مرۆڤایەتی خۆت بســـەلمێنە بەوەی



یارمەتی بدەیت تا هەڵدەســـتێتەوە نەوەك پێبکەنیت بە کەوتنەکەی, هەرگیز با دڵمان بەوە خۆش نەکەین کە کەســـانێك دەکەون ڕەنگە ڕۆژێك بێت ئێمەش بکەوین و پێمان پێبکەنن, ئەوەشـــت لەبیربێت دڵنیابە لەوەی ئەگەر یارمەتی کەس نەدەیت ڕۆژێك لە ڕۆژان پێویسـتت بە یارمەتی دەبێت و کەسـیش یارمەتیت نادات لەبەر ئە وەی پێنەزانینت بۆ ئەو چاکانەی لەگەڵت دەکرێن سـپڵەییەك بووە,

مەرج نییە هەمان ئەو کەســـەی یارمەتی دەدەیت و  هاوکاری دە کەیت هەمان ئەو کەســـە بێتەوە بەرامبەرت و یارمەتیت بدات بە ڵکو هەمووان ئەوە دەبینن کە دەیکەیت و  هەڵوێستە باشەکان لەکاتە تەنگانەکاندا هەرگیز لەبیر ناکرێن و لە هزری هەمووان‌دا جێگای خۆی دەکاتەوە و بە شێوازێکی تر دەبنە هۆکاری ڕزگاری بۆت.

یارمەتی هەموو کەسێك بدە ئەگەر یارمەتیشیان نەدابیت ڕەنگە ببیتە وانەیەك بۆیان (جەلالەدینی ڕۆمی) دەڵێت: (بە موحیبەت دڕکەکانیش دەبن بە گوڵ) نەرمونیان و میهرەبانیت جگە لەوەی زیـان بـەخۆت و بـەکـەس نـاگـەیـەنیـت ســـوود بـە خۆت و دەوروبەریشت دەگەیەنیت.

لە سەدەی بیست و یەکدا ناحەقی و سنور بەزاندنی زۆر هەیە ئە وەی لەم ســـەدەیە وێرانی و ناتەندروســـتی زۆر بەدوای خۆیدا دێنێت ئەوەیە زۆربەی ئەو ئازار و ئەشکەنجانەی کە دەدرێن وەك ســـاڵانی زوو ڕەنگە لەڕووی جەســـتەیی نەبێت لەئێســـتادا تەنها شـتێك کاری بۆ نەکرابێت ناخ و هەست و سـۆزی مرۆڤەکانە بێ ئەوەی ڕەچاوی هەستەکانیان بکرێت دەستدرێژی و نادادپەروەری زۆریان دەکرێتە ســەر, لەوانە لە دونیای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و تەکنەلۆژیا و ڕاگەیاندندا ئەوە بەتەواوی بەرچاو دەکەوێت, دە کرێت مرۆڤەکان بەهای ڕاستەقینەی خۆیان لەدەست بدەن کاتێك لەناکاو خۆیان دەبیننەوە لەنێو ئەو دونیا فراوان و بێ ســنورەدا ئە وکاتەی هەموو خەون و کار و ماندووبوونی خەڵکە بێ بەرهەمە کە ئەوەیە کەمێك تەماشاکەریان زۆربێت جا لای گرینگ نییە چی دەکات بۆ ئەوەی تۆزێك سـەرنجیان لەســەر بنوسـرێت و گرینگ نییە چی دەنوسـرێت جوێن و سـوکایەتیشـی پێ دەکرێت شـانازی پێوە دەکات, پێش ئەوەی خەڵکی ســـوکایەتی پێ کردبێت خۆی سوکایەتی بەخۆی کردووە و چەندین بابەتی هەتەری جێگای باس و ســـەرنج و توێژینەوە هەن بەڵام ئەمە مشـــتێکە لە خەرمانێك هەموو ئەوانە گاڵتە کردنێکی نوێی ئەم ســـەدەیەیە دەر ئەنجامە خراپەکانی هێواش هێواش بەدەر دەکەون.

هەموومان بەخۆداچوونەوەیەکی بێ دواخستنمان پێویستە سەبارەت بە کاردانەوەکانمان بەرامبەر بە پرس و بابەتەکانی پەیوەست بە مامەڵەکردنمان لەگەڵ کەسانی تر و تەنانەت گوفتار و جوڵە و سەرنجەکانمان بۆیە دوای مەخە و بیری لێبکەوە و خۆت چاکساز بکە بەوەی ببیت بەخۆت لە ڕێگا دروستەکەوە نە وەك نموونەیەکی خراپ و جێگای داخ و پەشیمانی بیت, دواجار دڵخۆشبە و هەست بەخۆت بکە چونکە بیر دەکەیتەوە و کار لە سەر چاکسازکردنی خۆت دەکەیت کە خودی بوون بەخۆتە بوون بەخۆتیش خوودی ژیانە.

**کۆیلەی دەروونی وەك کۆیلایەتی سەردەم!**

دڵنیابە لەوەی ئەگەر تاکە هۆکارێك هەبێت بۆ ئەوەی بڕیار بدەیت ببیت بەخۆت ئەوا دەیان ڕێگر هەن وادەکەن بترسیت لەوەی ببیت بەخۆت و ڕێگربن لە هەوڵەکانت و ببن بە بەربەستێك لە پێشتەوە و بوون بەخۆتت لێ بکەن بە دێوێکی ســـامناك تەنانەت بیرکردنە وەش لێی تووشـــی دڵـەڕاوکێیـەکی دەروونیت دەکـات, خوودی



مرۆڤ ئەگەر بێت و بێ ئاگابێت لە بوونی خۆی و ســـنورەکانی خۆی نەکێشـێت و هەمیشـــە پێنوســـەکەی دایە دەســـتی کەســـی بەرامبەر و ئەویش بە ئارەزووی خۆی ســـنورەکانی دیاری کرد, هێدی هێدی لە هەوڵی بەرتەســـککردنەوەی ســنورەکانت دەبێت و ســـنورەکانی خۆی فراوان دەکات بە وێنەیەك هەوڵی داگیرکردنی

ناوەوەی تۆش دەدات و تووشـــی دەســـتدرێژییەکی دەروونی و ناوەکی دەبێت کە کاریگەری لەســـەر کارەکتەری تۆ و تەنانەت قسە و هەڵسوکەوت و جوڵانەوەکانیشت دروست دەکات, تا وای لێدێت ســـەربەخۆیی خۆت لەدەســـت دەدەیت و جڵەوی خۆت لەدەستی خۆت نابێت و بە ئارەزووی خۆیان وەك چۆن هەست و دەروونتیان داگیر کرد ڕەفتار و کاردانەوەکانیشت لەژێر فەرمانی ئەوان دەبێت.

ئەوەی باســـکرا چیرۆکێکی دروســـتکراو نییە بەڵکو دەبێت بە ڕاســـتییەکی تەواو ئاشـــکرا ئەو کاتەی خۆت بخەیتە ژێر دەســـتی هەر کەســـێکەوە ئەوکاتەی کۆیلایەتییەکت قبوڵبێت کە نەك خۆت بەڵکە قســـەکانیشـــت خاوەنێکیان هەبێت, بەر لەوەی تووشـــی کۆیلایەتی دەروونی بیت بیر لە ئازادی هەرێمی ناوەوەی خۆت بکەوە و بیخەرە ژێر دەسەڵاتی خۆتەوە کە هیچ کەسێك بوێری ئە وەی نەبێت سنوری ئەو هەرێمە سەربەخۆیە ببەزێنێت و هەوڵی ئەوە بدات کە تووشی لەدەستدانی ئازادیت بکات, لەبەر ئەوەی بە داگیرکردنی هەرێمی ناوەوەی خۆت و لەدەســـتدانی ئارامی دەروونت جوڵە و کاردانەوەکانیشت لەدەست دەدەیت.

ئەوەی لێرەدا بانگەشـــەی بۆ دەکرێت ئەوەیە کە دەربازبیت لە پێنەگەیشتوویی و لاوازی هەست کردنت لەهەر پێشهاتێکی هەڕەشە ئامێز کە دەروون و ناخی تۆ و سەربەخۆیی و خوودناوەندیت لە بیرکردنەوە و هەوڵەکانت دەخەنە ژێر هەڕەشەوە و ڕێگر دەبن لە دۆزینەوەی خۆت و دیاریکردنی کەســـێتییەکی تایبەتمەند کە لە هیچ کەسێك نەچیت و بڕیاری باشترین لەنێو باشترینەکان بۆخۆت بدەیت و خاوەنی هەڵبژاردنی هەڵبژاردەکانبیت, لەبری ئەوەی خۆت ببیت بە یەکێك لە هەڵبژاردەکان! هەموو ئەوانە هەســـتی متمانە بەخۆبوونت لا دروســـت دەکات کە ئامانجە بەهێزەکەی بوون بەخۆتە.

**ببە بەخۆت نەك قسەی نێو کتێبەکان (نوسراوەکانی دەستی مرۆڤ)!**

کتێبەکان سەرچاوەیەکن بۆ زانیاری و هۆکارێکی گەورەی فراوانکردنی ئاستی دەستپێڕاگەیشتنی زانیارییەکانن لەهەمان کاتدا یارمەتیدەری فراوانکردنی بیر و هزرن, بە درێژایی کات دەبن بە پاشخانێکی مەعریفی و ڕەنگدانەوەیان دەبێت لەسەر قسە کردن و درك کردن بە زۆر ڕووی ژیان کە پێشتر نەبیندرابوون, دوونیای خوێندن و خوێندنەوە تەواو جیاوازە بۆ مرۆڤێك کە لەگەڵ خوێندنەوەی هەر دێڕێکی نوێدا بەتەواوی لێی تێبگات و لێکدانەوە و تێگەیشتنی هەبێت بۆ بابەتەکان و بتوانێت بیر لە چەمك و باسەکان بکاتەوە و بەو شێوەیەی کە خۆی باوەڕی پێی هەیە لێیان تێبگات نەك ئەوەی نوسراوە بەدەستی کەسانێکی تر, چونکە زۆرن ئەو دێڕانەی نێو کتێبەکان لەبری ئەوەی ببن بە فریادڕەسێك بۆ ژیانت وەك ئەوەی چاوەڕوانیان لێ دەکەیت دەبن بە هۆکاری شێواندنی بیرکردنەوەکانت و لەڕێدەرچوونی تۆ.

ئەوەی کە کەسێکی تر بیری لێ دەکاتەوە هەمان ئەوە نییە کەتۆ بیری لێ دەکەیتەوە, ئەوەی کەسێك هەڵی دەبژێرێت هەمان



هەڵبژاردەی تۆ نییە, ئەوەی تۆ پێویستتە هەموو کەس پێویستی

پێی نییە, ئەوەی خەڵکی دەینوسنەوە هەمان ئەوە نییە کە دەتەوێت بینوسییەوە, بیر لەوە بکەوە ئەوکاتەی کەسێکی تر لەبری تۆ بیر دەکاتەوە بوونی تۆ چی دەگەیێنێت؟, ژیانی تۆ تەواو جیاوازە لە دارشتن و قسەی نوسراوی سەر کتێبەکان بۆیە مافی ئەوە بەخۆت مەدە قسەی هیچ کەسێك و دێری هیچ کتێبێك ژیانی تۆ بە ئاقارێکی نادیاردا ببەن, تۆ بوونت هەیە کەوایە بیر بکەرەوە و خۆت بریارەکانی پەیوەست بە ژیانی خۆت بدە بەو شێوەیەی کە دروستە و لەگەڵ ئەو بارودۆخەی ئێستاتدا گونجاوە, تەنها بیرۆکەکان وەربگرە و شارەزایان ببە و بیانناسە و پاشان بە لەبەرچاوگرتنی لایەنە پەیوەستەکانی بابەتەکە دووبارە دایبرێژەوە بەو شێوەیەی کە گونجاوە بۆتۆ و بۆ ئەو بارودۆخەی ئێستات.

بیر لە بوونی خۆت بکەوە لەنێو دێری کتێبێکی نوسراوی دەستی کەسانێك ڕەنگە هەر نەشیان ناسیت, بیر لە بوونی خۆت بکەوە لە سەر زاری کەسانێك کە هەڵکەوتەی ژیانتان و هاوکێشەی ژیانتان تەواو جیاوازە لەیەکتری, ئەستەمە مرۆڤ بگات بەخۆی و دووبارەی هیچ کەسێك نەبێت لەژێر سایەی هەمان ئەو دێرانەی لەسەر کتێبەکان هەن, جیاواز بیر بکەرەوە بوونی تۆ لە بیرکردنەوەی تۆوە سەرچاوە دەگرێت, بگە بە بەهای خۆت ئەو کاتەی سەرچاوەی سەرەکی دارشتنی ئامانجەکانت بیرکردنەوەکانی خۆتن, ببە بەخۆت پێتی دەڵێت هەر دێرێکی نێو کتێبەکان بۆ ئەوەنین لەژیانی خۆتدا جێبەجێیان بکەیت بەڵکو لەپێناوی ئەوەن خۆت بیریان لێ بکەیتەوە و بەو شێوەیەی کە خۆت دەتەوێت بەکاریان بهێنیت, بە پێچەوانەوە زۆرکات تووشی دەرچوونت دەکەن لەو ڕێرەوەی کە هەڵبژاردەی خۆتبوو, واتای دەرچوون لە ڕێرەوی هەڵبژاردەی خۆت لەدەستدانی سەربەخۆیی تۆیە لە ئاستی بیرکردنەوەکانت و ئەو ئامانج و کارەی کە بۆی تێدەکۆشای, چونکە هەمان ئەو بارودۆخەی کە تۆی تێدایت ئەوە نییە کە لەنێو کتێبەکاندا بوونیان هەیە و تەواو جیاوازن لەبەر ئەوە بە دەقاودەقی لەسەر ژیانی خۆت تاقیان مەکەوە بەڵکوو بەو

شـــێوەیەی کە خۆت پێت باشـــە و گونجاوە بۆت بەکاریان بێنە و بیانکە بە یارمەتیدەر و ســـەرچاوەیەك بۆ درککردنت بە چەمکگە لێك و ئاشـنابوونت بە باسـە جیاوازەکان, تەنانەت ئەوەی لێرەشـدا دەیخوێنیتەوە.

**هاوکێشەی پلان و ستڕاتیژی بەرامبەر هاندان و شیکردنەوەی...**

پلان و ستراتیژی کەی؟ وە هاندان لەکوێ و چۆن؟
دەستپێکی هەموو ئەوانە لە داڕشتنی ئامانجی بوون بەخۆتەوەیە




ئەوەش لە هێزی خۆناسینەوە دەبێت واتا خۆتو ئامانجەکانت خۆتو باوەڕەکانت خۆتو ئەو داهاتووەی کە کاری بۆ دەکەیت و دەتەوێ دیاری بکە و بەرچاوڕوونیەکت هەبێت لەسەر خودناسیت و دوای ئەوە لەژێر کاریگەری کەسدا مەمێنەوە و دەستبەرداری مەبە لەبەر ئەوەی ئەوان پێیان وایە سەرکەوتوونابیت ئەوان گریمانەی شکستی تۆ دەکەن بێ ئەوەی هیچ بزانن دەتەوێ تۆش هەروا

ئاسـان وازبێنی؟ لەخۆت بپرسـە هۆکاری دەسـتپێکردنی تۆ بۆ ئەو ئامانجە چیبوو لەبەر چی دەتەوێت ببیت بەخۆت و خۆت بناسی و ئـەوەی دەتـەوێت ئـەوە ئـەنجـام بـدەیت؟, دوای هـەموو ئـەوانـە و لێکدانەوەکانت و گەیشـــتنت بە ئەنجامێکی دروســـت کە خۆت بناســیت و دوای ئەوە نەکەویتە ژێر کاریگەری هیچ قســـەیەکی ڕوخێنەر کە لە ڕاستیشدا بەتەنها لە چوارچێوەی گوماندا ماونەتە وە و هیچ بنەمایەکی دروســـتیان نییە, کەوایە لە هەنگاوی یەکەم دەگەیت بەوەی سەرکەوتووبی لە خۆناسینت و دانانی ئامانجێك و دوای ئـەوە بـەردەوام دەبیت لـەپێنـاوی ئـەوەی دەتـەوێت ببیت بەخۆت.
هەنگاوی دووەمی هاوکێشـــەکە گەیشـــتنە بە بەردەوامیدان بەو هەنگاو و ئاڕاســتەیەی کە دیاریت کردووە ئەوەشــیان بە هاندان دەبێت و بـەرچـاوڕوونیـەکت هـەیـە و توانـای جیاکـاریت هـەیـە لەنێوان ئەنجامدانی کارە باشـەکان و کارە خراپەکان, لێرەدا باسی هیچ ئاڕاســـتە و کارێکی باش یان خراپ نییە چونکە هەموو ئە وانەی ویسـتی بوون بەخۆیان تێدا هەیە دەتوانن جیاکاری لەنێوان کارە باش و خراپەکانیش بکەن و مرۆڤی سـەردەمیش ئاشـنایە بە هەموو ئەوانە و توانای ئەوەی هەیە چۆن ئاڕاسـتە دروسـتەکەی ژیانی خۆی دیاری بکات کە پێی ئاسـودەیە و سـەرچاوەیەکی لێوە دیارە و دەزانێت ئەگەر بەردەوامبێت دەگات بەکوێ لەبەر ئەوە لێرەدا چەمکی (هاندان) جێگای خۆی دەگرێت و کاری پێدەکرێت, تۆ هانی خۆت دەدەیت چونکە دەزانیت بۆ دەســـتت پێکردووە و دەزانیت ئەگەر بەردەوامبیت دەگەیت بەکوێ بۆیە بێ هیوا نابیت و هەوڵەکانی خۆت دەخەیتەگەڕ چونکە ئاشـــنای ئەوە بویت ئە وانەی هەوڵیان نەداوە لەکۆتاییدا هیچیان نەکردووە کەوایە چۆن ئەنجام بەدەست دەخەن, هەموو ئەوانەی سەرکەوتووبوونە لەبەر ئەوە گەیشتوونە بەو ئەنجامە کە بەردەوامیان داوە بەو ئاڕاستەیەی کە دیاریان کردووە, کەوایە نهێنی هاندان بەردەوامییە و کۆڵ نە دانە نەوەك سەرگەرمکردن و شۆڕکردنەوەت بەرەو ئاڕاستەیەکی

لێڵ و پڕ لە مەترسی و تەمومژاوی کە پیشەی ئەوانەن کە خۆیان نین و دەکەونە ژێر کاریگەری قســـە و هاندانە بە مەرامەکان و خۆیان لێ ون دەبێت و باجی ســـەرگەرمی و خۆنەناســـییەکەیان دەدەن دواجار.
خۆناسین ئەوکاتە دەبێت کە بزانیت کارە دروست و باش و ڕوونە کان کامانەن و کارە هەڵە و خراپ و لێڵەکان کامانەن و توانای ئە وەت هەبێت هەڵیان بژێریت و دارِشـــتنەوەیەکی دروســـتیان بۆ بکەیت کە چۆن ئەنجامیان بدەیت و بەردەوامی پێ بدەیت و داهێنانی تێدا ئەنجام بدەیت و دواجار بگەیت پێیان, کەوایە خۆت بناســـە و خۆت بەدواداچوون بکە و بڕیاربدە کە چی دەکەیت و چۆن ئەنجامی دەدەیت و لەکوێدا ســـوود لە چەمکی( هاندان) وەردەگریت و کاری پێ دەکەیت, ئەو کارە ئەنجام دەدەیت کە دروســـتە لات و باوەڕت پێی هەیە و لات گرینگ نییە چەندە ماندووکەرە تەنها کۆتایی هەڵبژاردەکە گرینگە و خۆت ناخەیتە بەردەمی دووڕیانی ئەوەی خۆت لات دروستە و ئەوەشی خەڵکی دەیکەنە هەڵبژاردەیەك و بۆتی دادەنێن کە زۆرجار دەستبەرداربوونە لەخۆت و کۆڵدانە لەو ئامانجانەی کە کاریان بۆ دەکەیت, ســـەرکەوتوودەبیت بەســـەر هەموو ئەو هەنگاوانە و ئەنجامی کۆتایی ئەســـتەم نییە و پێی دەگەیت ئەوکاتەی بەردەوام دەبیت! دواجار خۆت دەبینیتەوە لەو دونیایەی کە وێنات کردبوو و لەپێناویدا بەردەوام بویت ئەوکات کاتی پیرۆزبایی کردنە لەخۆت و شـــانازی بە بوونی خۆتەوە بکەیت و ســـەربەرزی لە بوون بەخۆتەوە وەدەست بخەیت.

